پەیامەکانی گەنجان
٣٨

چاپی دووەم







# چەمکی خودا و

# وەڵامی پرسیارەکان لەسەر ئیسلام

نوسینی : د.زاکیر نایك

وەرگێڕانی: محمد شێخانی




پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# چەمکی خوداو

# وەڵامی پرسیارەکان لەسەر

# ئیسلام

نووسینی: دکتۆر زاکیر نایک

وەرگێڕانی: محمد شێخانی

## ناسنامەی کتێب

📖 ناوی کتێب:( چەمکی خودا و وەڵامی پرسیارەکان لەسەر ئیسلام )

✍ نوسینی : دکتۆر زاکیر نایك

✏ وەرگێڕانی : محمد شێخانی

* ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ( ژمارە: ١٠ )

* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

* نۆبەی چاپ: دووەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٦

* ژمارەی لاپەڕە : ١٧١ لاپەڕە

* دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن

* نرخ تەنها : ( ٣٥٠٠) دینار

* سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد

* ئیمەیڵ: renwen٢٠٠٩@yahoo.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٧٤٥)ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە



# پێشەکی

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان (بە ناوی ئەو خوایەی کانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە).

درودوصەلات وڕەحمەت بڕژێت بەسەرپێغەمبەری پێشەوامان وەڕەزا و ڕەحمەت لەیاروشوێن کەوتوانی بێت تا ڕۆژی دوایی .

لەژێرسێبەری ئەم ئایەتەی خودای پەروەردگار کە لەسورەتی (النحل) دەفەرمووێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥ ﴾ ،( النحل )

واتا( خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لیزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدویٚ (موجادەلە بکە) بدویٚ بەچاکترین شێوە بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانیٚ بەوانەی گومڕابوون و لایاندا وە لە ڕێگاکەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.)

بەڕاستی کتێب و ڤیدۆکانی {شێخ احمد دیداد و د.زاکیرنایك و یوسف استێس و پیرفۆجل وشیخ خالدیاسین وابوهمزەو ابوعمرالباحث ود.هیثم طلحت و..........} لەم سەردەمە زۆر پێویستە تا هەموو گومانەکانی ئەم سەردەمە یەك بەیەك هەڵوەشێنەوە، وەئەم گومانە

بەقازانجی ئێمەی موسوڵمان تەوابێت چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە شـــارەزایمان زیاتربێـــت لەدینەکـــەی خـــوداوە باوەڕبونمـــان بەخوداپتەوتربێت وەجێگیربین لەسەردینەکەی خودا .

ئێمەش لەگەڵ تەواوی خۆشەویستمان بۆ هاوڵاتی کوردو وەبەتایبەتی لاوانی کورد بەپێویسمان زانی کەهەروەك هۆشیارکردنەوە، تاکەتاکەی هاوڵاتی خۆشەویست لەبەلاریدانی هاوڵاتی کورد لەسەرئیسلامی مەزن بـۆ ئیلحـادو مەسـیحیەتو......هتر.بۆیە لـەم سـەردەمە کەسـەردەمێکی پێشـکەوتوە وەگـەنجی موسـوڵمان هۆشـیاربووە بۆیـە دەیانـەوێ ئـەم گەنجانـە لەڕێلابـدەن وبیکـەن بەمەسـیحی بـەڵام گـەنجی کـورد زۆرلـەوە هۆشـیارترن کەمسـیحیەت قبوڵناکـات و وەهەرگوێشـی پێنـادات بـەڵام ئێستا کڵێسا زانیویەتی کەگەنجی کورد مەسیحیەت قبوڵناکات بۆیە بەناوی بێدینەوە دێن بۆگەنجان وەگومانەکانیان لەسەر ئیسلام بەناوی بێـدینی بـڵاو دەکەنـەوە بۆیـە ئێمـە کـەوەڵامی گومانـەکان دەدەینـەوە وەقسـەی زۆر لەگـەڵ ئـەم کەسـانە دەکـەین کـەگـومان بـڵاو دەکـەنەوە جـارێکیان لـەگەڵ یەکێك بەناوی بێدینی

گومانی بڵاو دەکەردەوە قسەم کرد

_ وتی: دەمەوێت گفتوگۆت لەگەڵ بکەم.

_ وتم: چ بیرو باوەڕێکت هەیە؟

_ وتی: بێ دین !



_ وتم: چۆن بێ دینێك؟

_ وتی: لە فەیسبووك پەیجێکم کردەوە و خەڵکم بێ دین دەکرد!

_ وتم: چۆن چۆنی؟

_ وتی: لەو پەیجەدا گومانێکی زۆرم لەسەر ئیسلام و موسوڵمانان بڵاودەکردەوە!

_ وتم: ئەی باشە ئەوان باوەڕیان پێت دەکرد؟

_ وتی: ئەی چۆن باوەڕناکەن! وێنەی پەیجەکەم هی ئەنیشتاین بوو بە ڕەش و سپی کە ئاستی زانستی من دەردەخات، ئینجا بە کەمێك گاڵتە و هەندێ دەستکاری زانست و جار جاریش بە عەقڵ دەچومە دڵی باوەڕدار و گومانم تیایدا دەچاند.

_ وتم: ئەو کارەت بۆ ئەوە بوو تا لە حەقیقەت ڕابکەی یان لەبەر ڕق و کینەت بوو لە ئیسلام؟

_ وتی: نا، لە ڕق و کینەم بەرامبەر ئیسلام!

_ وتم: بۆچی؟

_ وتی: چونکە من "مەسیحی" م بەڵام لە فۆڕمێکی بێ دینیدا!

_ وتم: ئەی بۆ هەر لەسەرەتاوە نەت وت کە مەسیحیت، ئا ئەم دوو ڕووییەت لە چیە؟

_ وتی: ئاخر ناتوانم، چونکە موسوڵمانان ئەوە قەبوڵ ناکەن کە "سێ خوا" (الثالوث المقدس، Trinity) وجودی هەبێ، وە بەوەش ڕازی نابن کە

بە کەسێکی لە دایك بوو -عیسی ی مەسیح "علیه السلام"- بوترێت خوا !

_ وتم: جا کە دینەکەت ئاوایە ئەی بۆچی وازی لێناهێنی؟

_ وتی: لەعنەتی خوات لێبێ، دوورکەوە لێم، وات لێکردم ڕووی خۆم بۆ تۆ ئاشکرا بکەم.

بۆیە ئێمەش بەپێویستمان زانی وەك خزمەتێك بەگەنج ولاوانی ولاتەکەمان ئەم کتێبەیان پێشکەش کەین وەك چەند گەنجێکی لاو خەمخۆری ئەم ئیسلامە هەرئەوەندەمان لەدەسهات وەچاوەڕوانی کتێبە بەسودەکانی د.زاکیربن کەماوەماوە کتێبێکی ئەوتان پێشکەش دەکەین بمان بوورن لەهەرهەڵەیەك وکەمتەرخەمیەك ...

بەهیوای سودوەرگرتن

# بەشی یەکەم:

# "چەمکی خوالە ئاینە سەرکیەکان"

## دابەشکردنی ئەدیانە سەرەکییەکان:

هەموو دینەکانی جیهان ئەتواندرێت دابەشبکرێن بۆ دینە (سامییەکان) و دینە (غەیرسامییەکان) ، کە دینە (غەیرسامییەکان)یش دەتواندرێت دابەشبکرێن بۆ دینە (ئارياييەکان) و دینە (غەيرئاريايیەکان).

**دینــە ســامییەکان:** ئەمانـە کۆمـەڵێك دیـنن کـە لـە سـامییەکانەوە سەرچـاوەدەگرن،بەگوێرەی ئینجیـل، پێغەمبــەر نـوح (علیـة الصـلاة والسـلام) کـوڕێکی هــەبوو بــەناوی (ســام) نــەوەکانی ئــەمیش بــە سـامییەکان ناسـراون، هەربۆیـە دینـە سـامییەکان ئـەو دینانـەن کـە لـە جولەکــەو عـــەرەب و ئاشـــوورییەکانەوە سەرچـــاوە دەگـــرن کـــە ســەرەکیترینیان ئیسـلام و مەسـیحییەت و یەهودیەتـە، کـە هـەموویان دینی پێغەمبەرایەتییە کە بڕوایان بە دابەزینی ڕێنمای و وەحی هەیە لە خوداوە بۆ پێغەمبەرەکان.

## دینە غەیرسامییەکان ... زیاتر دابەشدەکرێن بۆ:

### أ/ دینە ئارییەکان:

ئەمانــە دیــن گــەلێك کــە لــە نیــوان گەلــە ئارییــەکان بڵــاو بــوون و سەرچاوەیان گرتووە، گروپگەلێکی بەهێزی هیندۆ- ئەوروپییەکان کە بە ئێران و باکوری هیندا بڵاوبوونەوە لەساڵانی ١٥٠٠ – ٢٠٠٠ پێش زاین.

کــە دینــە ئارییــەکانیش زیــاتر دابەشــدەکرێن بــۆ (ڤێــدیکی) وە (غیرڤێدیکی)، دینە ڤێدیکییەکان بەهەڵە ئێستا ناودەبرێن بە هیدویزم یاخود براهمینیزم. وە دینـە غیرڤێدیکییـەکانیش سـیخیزم ،بـودایزم، جـاینیزمو هتـد..... کـە نزیکـەی هـەموو دینـە ئاریاییـەکان دیـنی بـێ پێغەمبەرن .

بەڵام دیـنی زەردەشـتی کـە دینێکـی ئارییـە و لـە جـۆری غیرڤیدیکییـە بەڵام دەبینین ئیدیعای هەبووی پێغەمبەرێك دەکەن.

### ب/ دینە غەیرئارییەکان:

دینە نائارییەکان سەرچاوەیان زۆر جیاواز و هەمەجۆرە، کۆنفوسیایزم و تۆیزم چەند دینێکی چینین لەکاتێکدا شینتۆیزم دینێکی یابانییە.

زۆرێك لەم دینە نائارییانە چەمکێکی ڕوونیان نییە بۆ خودا بۆیە زیاتر وەك چەند سیستەمێکی فیکری ئاماژەیان بۆدەکرێت وەك لەوەی پێیان بوترێت دین.

## دروسترین پێناسە بۆ خودا لە هەر دینێکدا

چـەمکی خـودا بـەپێی تێـڕوانینی دینێـك ناتوانـدرێت حـوکمی لەسەربدرێت بەتەنها تێبینیکردنی شوێنکەوتوانی. شتێکی زۆر باوە کە شوێنکەوتوانی دینێـك بـێ ئاگـاو نـەزان بـن سـەبارەت بـەوەی کـە کتێبەکـەیان چـی دەڵێـت سـەبارەت بـە چـەمکی خـودا، بۆیـە هەمیشـە باشترایە بۆ تێگەشت لە چەمکی خودا لـە هەردینێکدا بگەڕێینـەوە بـۆ سەرچاوە پیرۆزەکانیان. با پێکەوە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەدیانـەکانی تر بکەین بۆ ئەوەی بزانین چییان هەیە بۆ وتن لەسەر چەمکی خودا.

# چەمکی خودا لە هیندویزمدا

دیارترین دین لە نێوان دینە ئارییەکاندا دینی هیندویزمە. 'هیندوو' لە ڕاستیدا ووشەیەکی فارسییە کە بەواتای ناوچەکانی پاش دۆڵی (ئیندون)ەوە دێت. هەرچۆنێك بێت لە ئێستادا ووشەی هیندویزم بەکاردێت

وەك ناوی دینێکی سەربەخۆ و تایبەت بە خەڵکانی ئەو ناوچەیە. کە ئەساسەکانی ئەم دینە بریتین لە 'ڤێداس' ، 'ئوپانیشاد' ، 'باگوت گیتا'.

## چەمکی باو بۆ خودا لە ئاینی هیندویزمدا:

هیندویزم زیاتر بەوە بەناوبانگە کە دینێکی فرەبیروڕاو عەقیدەیە. هەر لەڕاستیشدا زۆرێك لە شوێنکەوتوانی ئەم دینە لایەنگری ئەمە دەکەن وە بانگەواز بۆ دینەکەیان دەکەن وەك دینێك کە خاوەنی چەندین خودابێت. ئەمە لەکاتێکدا هەندێك لە هیندووەکان بڕوایان بە هەبوونی( ٣٣ )تاوەکو ( ٣٣٠ )ملیۆن خودا هەیە.

بەڵام هیندووە خوێندەوار و تێگەشتووەکان کە شارەزای دینەکەیانن سورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت هیندووەکان بڕوایان بە تەنها هەبوونی یەك خودا هەبێت و بیپەرستن.

دیارترین جیاوازی لە نیوان موسوڵمانان و هیندووەکان لەسەر چەمکی باوی خودایە لای هیندووەکان، کە بڕوایان بە فەلسەفەی (پانسیزم- یەکگرتوویی) هەیە کە ئیدیعای ئەوەدەکات کە هەموو شتەکان بە زیندوو نا زیندووەوە بەشێکن لە خوداو پیرۆزن. هەر لەبەر ئەمەشە کە هیندووەکان دار و خۆر و ئاژەڵ و مرۆڤەکانیش بە بەشێك لە خودا دەزانن، بۆ هیندوویەکی ئاسایی هەموو شتێك خودایە.

بەڵام پێچەوانەی ئەمە لە ئیسلامدا هەیە کە هانی مرۆڤایەتی دەدات کە خۆی و هەموو دەوروبەرەکەشی بە نموونەی دروستکراوی خودا بزانن و مەخلوقن نەوەك خۆیان بە بەشێك لە خودا بزانن. بۆیە لەم ڕوانگەوە موسوڵمانان بڕوایان وایە کە هوموو شتێك موڵکی خودایەو لە لایەن ئەوەوە دروستکراون جا هەر لە دار و بەردەوە بیگرە هەتاوەك و خۆر و گەلە ئەستێرەکان.

**قورئان:** کە دیارتین ئامارژە لە قورئان ئەوەیە کە هیچ کەس و شتێك نەپرسترێت بێجگە لە الله.

ئێستا با بەیەکەوە ئەو بابەتانە هەڵبسەنگێنین کە ئاینی ئیسلام و هیندویزم تێدا هاوبەشن.

**باگوات گیتا:** دیارترین و باوترین کتابی پیرۆزە لە ناو هەموو هیندووەکاندا، تێیدا چەندین دەق هەن کە ئاماژە بە یەکتا پەرستی دەکەن و دژی پەرستنی خودای جۆراوجۆرن:

( ئەوانەی کە ژێریان پارەو ماڵ و سامان دزیویەتی خۆیان داوە بەدەستەوە بۆ نیمچە خوداو خودا دروستکراوەکانیان کە ئەمان شوێن ڕێنمای و ڕێوشوێن و پەرستشێك دەکەون کە لەگەڵ سروشت و بەرژەوەندی خۆیان دەگونجێت )

"باگوات گیتا بەشی(٧)ئایەتی(٢٠)" لێرەدا گیتا ئاماژە بەو کەسانە دەکات کە مادده پەرستن و بۆیە خودا درۆزینەکان دەپەرستن نەوەك خودای ڕاستەقینە.

**ئوپانیشاد:** ئوپانیشادیش بەهەمان شیوە بە کتێبێکی پیرۆزی هیندووەکان دادەنرێت، کە تێیدا تێبینی چەند دەقێك دەکەین:

(ئەو تەنها یەکەو نابێت بە دوو) (ئوپانیشاد٦ – ٢ – ١ )

(ئەو نە خێزانی هەیە نە خودا) (ئوپانیشاد- ٦، ٩ )

(هیچ هاوتاو هاوشێوەیەکی نییە) (ئوپانیشاد- ١٩:٤ )

(هیچ هاوتاو هاوشێوەیەکی نییە کە ناوی ئەو سەربەرزییەکی گەورەیە) (ئوپانیشاد-لاپەڕە- ٧٣٦ – ٧٣٧ )

با ئەو دەقانەی سەرەوە بەراوردبکەین بە چەند دەقێکی قورئان:

﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤ ﴾ الاخلاص،(وە هیچ هاوشێوەیەکی نییە) ( قورئان – ١١٢:٤)

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ١١﴾ الشوری ،(هیچ شتێك نییە بەوێنەی ئەو زاتە هیچ شتێك لەو ناچێت) (قورئان– ٤٢:١١)

گەر بنوارینە دەقێکی تری ئۆپانیشاد و بەراوردی بکەین بە قورئان:(شێوەی ئەو هەرگیز نەبینراوە، کەس بەچاوی خۆی نەیبینیوە، ئەوانەی کە بە دڵ و بە ئەقڵ دەیناسن ئەوا پەیوەندییەکی پتەویان دروستکردووە و هەمیشە زیندوو دەبن) ( ئوپانیشاد– ٤:٢٠)

قورئانیش بەهەمان شێوە باسی ئەم لایەنە دەکات و خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ١٠٣ ﴾ الانعام، (دەزگای بینایی و ئیدراکی مرۆڤ ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، بەڵام زانیاری و ئەسەری ئەو خودایە هەموو شوێنێکی گرتۆتەوە، ئاگاداریشە بەهەموو دەزگاکانی بینایی. هەرئەو وردبین و ئاگایە)(قورئان– ٦:١٠٣)

**ڤیــداس:** ڤیـداس دادەنرێـت بـە پیرۆزتـرین کتـاب لـە نـاو هـەموو هیندووەکانـدا ، کـە ٤ ڤیداسـی سـەرەکی بوونیـان هەیـە (ڕیـگ ڤیـد، یاجور ڤید، سام ڤید، ئەسارڤا ڤید).

١. **یاجور ڤید:** چەند دەقێك لەم کتێبە:(هیچ شتێك نییە لە شێوەی ئەو)

(یاجورڤید- ٣:٣٢ )

وە دواتریش تێیدا ئاماژە بەوەدەکات کەو ئەو لەدایك نەبووە.

(ئەو بێجەستەو پاکە) (یاجورڤید ٨:٤٠)

(ئـەوان دەچـنە تاریکییـەوە ، ئەوانـەی کـە شـتە سروشـتییەکان دەپەرستن، وە ئەوانەی کە شتە دروستکراوەکانن دەپەرستن دەچنە قوڵاییەکی زیاتری تاریکییەوە) (یاجورڤید ٩:٤٠)

٢. **ئەسـراڤاڤید:** چـەند دەقێـك لـەم کتێبـە:(خودا گـەورە و پـیرۆزە)

ئەسراڤاڤید- ٢٠،٥٨:٣

٣. **ڕیگ ڤید:** کۆنترینی هەر ٣ ڤیداسەکەیە ، وە بە یەکێك لە کتابە زۆر پیرۆزەکانیش دادەنرێت لای هیندووەکان. کە تێیدا ئاماژەبەوەدەکات کە ڕاهیبە زیرەکەکانیان زۆرجار خودایان بە تاك و تاقانە ناوبردووە .

(ڕیگڤیدا-١:١٦٤:٤٦)

لە ڕێگڤێدادا ئەتواندرێت بوترێت زیاد لە(٣٣)سیفەتی خوای تێدایە کە یەکێك لەوانە "براهما" کە بەواتای خالیق دێت کە موسوڵمانان هیچ کیشەیەکیان لەگەڵیدا نییە بەڵام کێشەمان لەگەڵ ئەوەدا هەیە کە هیندووەکان بە خوایەکی ٤ سەری دادەنێن.

دەقێک لە ڕیگڤێدادا:(ئەی هاوڕێینە ، هیچ کەسێك مەپەرستن تەنها ئەونەبێت، ئەو کە خودای پیرۆزە) ڕێگڤید-٨:١:١

وە لە کتێبی ڕیگڤێدا سایتیدا لە بەشی ٦ لاپەڕە ١٨٠٢و١٨٠٣ئاماژە بە چەند دەقێکی یەکتاپەرسی دراوە، وەك:(تەنها یەك خودا هەیە، دوو نا، هەرگیز، هەرگیز و هەرگیز)

بۆیە تەنها لەڕێی بەدواداچوونێکی هێمنانەوە دەتوانین بگەین بە مەقیقی دینی هیندویزم لەسەر چەمکی خودا.

# چەمکی خودا لە سیخیزمدا

سیخیزم دینێکی غیرسامییە و دینێکی ئاری غیر ڤێدیکییە. هەرچەندە دینێکی سەرەکی نییە لە جیهاندا، بەڵکو لقێکە لە ئاینی هیندویزم کە لە لایەن گورو(ڕاهیب) نانەکەوە دۆزرایەوە لە سالانی کۆتایی سەدەی (١٥) سەرچاوەی سەرهەڵدانی ناوچەکانی پاکستان و باکوری ڕۆژئاوای هیندە کە پێی دەوترا (پونجاب) واتە خاکی پینج ڕووبارەکە. گورو نانەك لە کشاتریا لەدایك بووە لە خێزانێکی هیندوو بەڵام زۆر کاریگەربوو بە دینی ئیسلام و موسوڵمانەکان.

**پێناسەی سیخ و سیخیزم:** وشەی "سیخ" وەرگیراوە لە ووشەی "سیسیا" بە واتای مورید یاخود شوێنکەوتە. ئاینی سیخییەکان ئایی (١٠)گوروەکەیە (ڕاهیب)، یەکەم گورو کە نانەك بوو وە دەهەم و کۆتا گوروگورو گۆبین سینغ بوو.. کتێبی پیرۆزی سیخییەکان پێی دەوترێت 'سری گورو گرانز' وە پێشی دەوترێت "ئادی گرانز ساهیب" ٥ "ك" یەکە: هەموو سیخێك دەبێت پەیوستبێت بە ٥"ك" یەکەوە کە دەبن بە پێناسی ئەوان.

١. کیش : قژێکی درێژ کە هەموو گوروەکان دەیان هێشتەوە.

٢. کانغا : شانەکردنی قژ، دەبوو قژیان بە پاك و خاوێنی ڕابگرن.

٣. کادا : بازنەی کانزایی ، بۆ بەهێزکردنی لەش خۆپاراستنی جەستەیی.

٤. کیرپان : هەڵگرتنی چەقۆیەك بۆ پارێزگاری خۆی.

٥. کاچا : جلی ژێرەوەی تایبەت کە درێژبۆتەوە بۆ زیادبوونی گرجوگۆڵی..

**مولمانترا:** سەرەکیترین ڕێبازی سیخیزم، باشترین پێناسە کە هەر سیخێك بتوانێت لەسەر چەمکی خودای بکات وتەی (مول مانترایە) ، کە ئەم ڕێبازە لەسەرەتای کاتی "گورو گرانز ساهیب" سەری هەڵدا.

کە لە سری گورو گرانز ساهیب ئایەتی - ١ دا دەڵێت :

( تەنها یەك خودا بوونی هەیە، کە پێی دەوترێت خالیقەکە ، کە دوورە لە ترس و ڕقلێبوونەوە هەتاهەتاییەو لەکەس نەبووە، گەورەو پیرۆزە)

دینی سیخیزم سنور بۆ چەمکی خودا لای شوێنکەوتوانی دادەنێت بەوەی ە تەنها یەك خودای گەورە و بەتوانا هەیە کە نادیارە و لەسەر فۆڕمی (ئێك ئۆمکارا).

لە فۆڕمە دیارەکەیدا کە بە "ئۆمکارا" ناودەبرێت خودا چەند سیفەتێکی هەیە:

* کارتار: خالیق

* ساهیب: خودا

* ئاکال: هەتاهەتایی

* ساتاناما: ناوە پیرۆزەکە

* پارڤادیگار: چاودێریکەر

* ڕەهیم: بەخشندەك

* کەریم: چاکەکار

وەهەروەها پێشی دەوترێت "وەهی گورو' خودای تاك و تەنهاو ڕاستەقینە.

لەگەڵ ئەوەی کە دینی سیخیزم سورە لەسەر هەبوونی یەك ڕێبازی یەکتپەرستی ، وە باوەڕیشیان بە " ئاڤاتاراڤادا " واتە هاتنی خودا بە شێوەیەکی بەرجەستە. واتە بڕوایان وایە کە خودا لەسەر شکڵی مرۆڤ خۆی دەرناخات کە بە "ئەڤاتارا" ناسراوە. وەهەروەها سیخیزم زۆر بە توندی دژی بتپەرستییە.

## کاریگەربوونی "گورو نانەک" بە "کەبیر"

گورو نانەك زۆر کارتێکراو بوو بە وتەکانی سانت کبیر هێندە پێی کاریگەربوو کە هەندێك لە بەشەکانی سری گورو نانەك ساهیب دوو بەیتی سانت کەبیری تێدایە.

یەکێك لەو وتانە:( هەمووان بیری خودایان دەکەوێتەوە لەکاتی کێشەو چەرمەسەریدابەڵام کەس بیری لەلای خودا نییە لەکاتی ئاشتی و خۆشیدا، ئەوکەسەی کە لەکاتی ئاشتی و خۆشیدا بیری لایخودایە ئیتر بۆچی توشی کێشەدەبێت؟)

با ئەم چەند دێرە بەراورد بکەین بە قورئان....

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ ﴾ الزمر، واتا:(ئادەمیزاد کاتێك ناخۆشی و زەرەرێکی توشهات، هاوار و هانا بۆ پەروەردگاری دەبات و لێیدەپاڕێتەوە. پاشان کاتێك خودا دەرووی لێکردەوە ئەسا چیتر دووعای نزاکانی فەرامۆش دەکات و بیری خوای نامێنێت ) ( قورئان ٣٩:٨ )

# چەمکی خوا لە ئاینی زۆرۆئەستریانیزم (زەردەشتی)

ئاینی زۆرۆئەستریانیزم یەکێکە لە دێرینترین ئاینەکانی ئارییەکان کە زیاترە (٢٥٠٠) ساڵ بەرلەئێستا لە ئێران سەری هەڵداوە. هەر لەبەرئەمەشە کە ژمارەی شوێنکەوتوانی کەمە کە دەکاتە نزیکەی سەد و سی هەزار کەس لەسەرتاپای هەموو جیهان. پەیامبەر ئێرانیەکان (زۆرۆستر) "زەردەشت" دامەزرێنەری زۆرۆئەستیریانیزمە، پوڕتووکی پیرۆزی ئەم ئاینە بریتین لە "دەساتیر" و "ئاڤێستا". وشەی خوا لە ئاینی زۆرۆئەستریانیزم پێی دەوترێت "ئاهورا مەزدا". وشەی "ئاهورا" بەمانای "خوا" دێت و وشەی "مەزدە"ش بەمانای "زانا" دێت، کەواتە هەردووکیان بەیەکەوە "ئەهروو مەزدا" واتای "خوای زانا" دەگەیەنێت: ئاهورامەزدایش جۆرێکە لە جۆرەکانی باوەڕبوون بە تاکێتی خوا و بە یەکتا پەرستنی.

✍ ..تایبەتمەندییەکانی خوا بەگوێرەی "دەساتیر" :-

١. خوا تاك و تەنیایە.

٢. خوا هاوشێوەی نیە.

٣. نەسەرتای هەیە و نەکۆتایی.

٤. ئەو نە باوکی هەیە نە دایك، هەروەها خێزان و منداڵیشی نیە.

٥. ئەو شێوە یاخود وێنایەکی نیە.

٦. نە چاو ئەتوانێت ببیبنێت، نەهێزی بیرکردنەوە ئەتوانێت بیربکاتەوە لێی.

٧. ئەو لەسەروو هەموو ئەو شتانەیە کە ئێمە بەمێشك و خەیاڵماندا دێت.

٨. ئەو لەخودی خۆمان لێمان نزیکترە.

✍.. تایبەتمەندییەکانی خوا بەگوێرەی "ئاڤێستا" :-

بەگوێرەی ئاڤێستا هەردوو "گاتاکان" و "یەسنا" کۆمەڵێك تایبەتمەندی جیاواز ئەدەنە پاڵ "ئەهروومەزدە"، لەوانەش :-

١. بەدیهێنەر. (یەسنا ٣١: ٧-١١)، (یەسنا ٤٤:٧)، (یەسنا ٥٠: ١١)، (یەسنا ٥١: ٧).

٢. گەورە و بەتوانا، بەهێز. (یەسنا ٣٣: ١١)، (یەسنا ٤٨: ٦).

٣. میهرەبان و دلۆڤان. (یەسنا ٣٣: ١١)، (یەسنا ٤٨: ٦).

٤. بەخشندە. (یەسنا ٤٣: ٤، ٥، ٧، ٩، ١١، ١٣، ١٥)، (یەسنا ٤٤: ٢)، (یەسنا ٤٥: ٥)، (یەسنا ٤٦: ٩)، (یەسنا ٤٨: ٣)

## چەمکی خوالەئاینی جودیزم (جولەکە)

ئاینی جولەکە یەکێکە لەئاینە سەرەکیەکانی ڕەگەزی سامیەکان. شوێنکەوتوانی ئەم ئاینە پێیان دەوترێت "جولەکە" و باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر موسا هەیە. ئەم چەند دێرەی خوارەوە لە (دیوتیرۆنۆمی) "کە دەکاتە پێنجەم پەڕتووکی پیرۆزیان" چەند ئامۆژگاری و ڕاسپاردەیەکی پێغەمبەر موسایە:

* ئەی نەوەی ئیسرائیل گوێبگرن، خودای ئێمە یەك خودایە. (ئینجیل، دیو ٦: ٤).

* بڕوانە ئەم دێرەی پەڕتووکی (ئیسایە) کە دەڵێت : (بەتەنها من پەروەردگارم، هیچ ڕزگارکەرێکی تر نیە لەپاڵ مندا) (ئینجیل،ئیسایە ٤٥: ١١).

* تەنها من خودام، هیچ خوایەکی تر نیە، هیچ خوایەکی تر هاوشانم نیە. (ئینجیل،ئیسایە ٤٥: ٥).

* من خودام و هیچ خوایەکی تر بوونی نیە. من خودام و هیچ هاوشێوەیەکم نیە. (ئینجیل،ئیسایە ٤٦: ٩).

ئاینی جولەکە ڕەخنەدەگرێت لە پەرستنی بت، هەروەك لەم چەند دێرەی خوارەوەدا ڕووندەبێتەوە:-

- "ئێوە نابێت هیچ خوایەکی ترتان هەبێت جگە لە من. ئێوە نابێت هیچ وێنەیەکی داتاشراو دروست بکەن بۆ خوا لە هاوشێوەی هەرشتێک لە ئاسمانی سەروو، یاخود لە زەوی خوارەووە، یاخود ئەوەی لەناو ئاوی زەویدا هەیە. ئێوە نابێت هەوڵبدەن کە کڕنۆشیان بۆ ببەن یاخود بیانبینن چونکە تەنها من پەروەردگارم، من خوایەکم حەسوودم...." (ئینجیل،ئیکسۆدۆس ٣٠: ٢-٥)

- ئێوە نابێت هیچ خوایەکی ترتان هەبێت جگە لە من. ئێوە نابێت هیچ وێنەیەك داترشن بۆ خودا هاوشێوەی هەرشتێك لە ئاسمانی سەروو، یاخود زەوی خوارەووە، یاخود ئەوەی لەناو ئاوی زەویدا هەیە. ئێوە نابێت خۆتان بۆ بچەمێننەوە بۆیان، وە نابێت خزمەتیشیان بکەن، لەبەرئەوەی تەنها من خودام، من خوایەکی حەسوودم...." (ئینجیل،دیو ٥: ٧-٩)

## چەمکی خوا لە ئاینی کریستیانیتی (مەسیحی)

مەسیحیەت یەکێکە لە ئاینەکانی ڕەگەزی سامیەکان، کە دەوترێت نزیکەی دوو بیلیۆن شوێنکەوتوی هەیە لەهەموو جیهاندا. ناوی "کریستیانیتی" وەرگیراوە لەناوی "جیزز کرایس" کە دەکاتە پێغەمبەر عیسا. پێغەمبەر عیسا بەهەمان شێوە کەسایەتیەکی بەڕێزە لەئاینی ئیسلامدا، هەروەها ئیسلام تاکە ئاینی غەیرە مەسیحیە کە فەرمانی کردووە بە بڕوابوون بە پێغەمبەر عیسا.

بەڵام پێش ئەوەی چەمکی خوا لە ئاینی مەسیحیدا تاوتوێ بکەین، ئەوە دێین باس لە پلەوپێگەی پێغمبەر عیسا دەکەین لە ئاینی ئیسلامدا.

* ئیسلام تاکە ئاینی غەیرە مەسیحیە کە بڕوابوونی بە پێغەمبەر (عیسا)ی کردۆتە بەشێك لە ئیمان. هیچ موسوڵمانێك پێی ناوترێت موسڵمان گەر هاتوو بڕوای بە پێغەمبەر عیسا نەبوو.

* یەکێك بووە لە بەڕێزترین و بەهێزەکانی پەروەردگار.

* ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کەوا لەدایك بوونی پێغەمبەر عیسا دەرئاسا بووە بەهۆی ئەوەی بەبێ بوونی باوك بووە، کە زۆرێك لە مەسیحیەکانی ئەم چەرخە باوەڕیان بەمە نیە.

* ئێمە بڕوامان بەوە هەیە کە ئەو چارەسەری نابینا و ئەوانەی تێکچوونی پێستیان هەبووە کردووە، بەڵام هەموو ئەمانەش بەیارمەتی و ڕەزامەندی پەروەردگار.

ڕەنگە کەسێك هەبێت و بپرسێت باشە ئەگەر موسڵمانەکان و مەسیحیەکان بەم شێوەیە ڕێزدەگرن لە پێغەمبەر عیسا و خۆشیان دەوێت، ئەی کەواتە لایەنە ناکۆك و دژەکەیان چیە؟. جیاوازی سەرەکی ئاینی ئیسلام و مەسیحیەت لە پێداگیری مەسیحیەکانە لەبەخوادانانی پێغەمبەر عیسا. ئەمە لەکاتێکدا بەلێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکانی ئاینی مەسیحی ئەوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا هەرگیز بانگەشەی بۆ خوایەتی خۆی نەکردووە. هیچ وشەیەك یاخود دێڕێك نیە لەهەموو ئینجیلدا کە تێیدا پێغمبەر عیسا بەخۆی وتبێتی "من خودام" یان "من بپەرستن". بەڵکو بەپێچەوانەوە ئینجیل ژمارەیەك گوفتاری تێدایە کە پێغەمبەر عیسا تەواو پێچەوانەی بانگەشەی خۆدانانی بەخوا ئامۆژگاری خەڵکی کردووە. بڕوانە ئەم چەند دێرەی ئینجیل کە لەسەر زاری پێغمبەر عیسا تۆمارکراون:-

* باوکی من لەمن گەورەترە. (جۆن ١٤: ٢٨)

* باوکم لەهەموو شتێك گەورەترە. (جۆن ١٠: ٢٩)

* ..... من بەڕۆحی خودا شەیتان بەدەردەنێم..... (مەتا ١٢: ٢٨)

* .... بەپەنجەی خودا شەیتان بەدەردەنێم.... (لوقا ١١: ٢٠)

* من خودی خۆم ناتوانم هیچ شتێك بکەم. هەر کە ئەبیستم یەکسەر بڕیاردەدەم. بڕیاردانی منیش دادپەروەرانەیە چونکە ویستی نیە بەڵکو ویستی باوکمە، کە بۆ منی ناردوو.

✍..ئەرکی پێغەمبەر عیسا جێبەجێکردنی شەریعەتەکانی تر بوو:-

پێغەمبەر عیسا هەرگیز بانگەشەی خوایەتی بۆ خۆی نەکردووە. ئەو ڕاست و ڕەووان سروشتی ئەرکەکەی خۆی ئاماژە پێداوە. پێغەمبەر عیسا خوادا ناردی تاکو یاساکان یاخود شەریعەتەکانی پێش خۆی جێبەجێیان بکات و کارایان پێبکات. ئەمەش زۆر بەڕوونی لەو قسانە دەبینرێن کەپێغەمبەر عیسا خۆی کردوونی، بۆ نموونە:-

- "ئەوە بزانن کە من نەهاتووم تاوەکو یاساکان تێکبدەم، یاخود نەهاتووم تاکو پێغەمبەرەکان لەناوبدەم. من ناهاتووم بۆ تێکدان بەڵکو هاتووم بۆ کارپێکردن. بەتووندی پێتان ڕادەگەیەنم ئەگەر ئاسمان و زەوی تێپەڕن و بڕۆن ئەوە نابێت بچووکترین بەشی یاساکان پشتگوێ بخرێن بەڵکو دەبێت هەموویان جێبەجێ بکرێن."

- " جا ئەوەی لابدات لە یەکێك لەو فەرمانانە یاخود کەسانی تر هانبدات بۆ سەرپێچیکردن ئەوە لەبەهەشتدا بە بچووك سەیردەکرێت. بەڵام ئەوەی جێبەجێیان بکات و ئامۆژگاری کەسانی تر بکات بەکردنی، ئەوە بە گەورە سەیردەکرێت لە بەهەشتدا."ئینجیل، مەتا ٥: ١٧- ٢٠"

✍..پەروەردگار پێغەمبەر عیسای ناردووە:-

ئینجیل باس لە سروشتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر عیسا دەکات لەم چەند دێرەدا:-

- "...هەروەها ئەو قسانەی لەمنی دەبیستن هی خۆم نیە بەڵکو باوکم پێیداوم." "ئینجیل، جۆن ١٤:٢٤"

- "هەروەها ژیانی نەمری و هەمیشەیی بۆ کەسێکە لە ئێوە کە خوای تاك و حەق بناسێت کە (عیسا)ی بۆ ناردوون." "ئینجیل، جۆن ١٧- ٣"

پێغەمبەر عیسا بچوکترین بۆچوونی بەخوادانانی خۆی ڕەتکردۆتەوە، ئێستاش بابەیەکەوە لەم ڕووداوانە بڕوانین کە لەئینجیلدا هاتووە:-

" ووردبنەوە لەو کاتەی کە یەکێك هات و بەئەوی وت "ڕابەری چاك"، چ کارێکی باش هەیە گەر بیکەم دەبمە خاوەنی ژیانێکی هەمیشەیی؟. ئەویش پێی وت: بۆچی من بە چاك بانگدەکەیت؟ هیچ کەسێك چاك نیە تەنها یەك زات نەبێت، کە ئەویش پەروەردگارە. بەڵام ئەگەر ژیانێکی

هەمیشـــەیت دەوێـــت ئـــەوە پارێزگـــاری بکـــە لـــە بەجێگەیانـــدنی فەرمانەکان." "ئینجیل، مەتا ٥: ١٧- ٢٠"

ئەم چەند دێرەی سەرەوە بەهەموو شێوەیەك باوەڕی بەخوازانینی پێغەمبەر عیسا و ڕزگاربوونی مرۆڤ بەهۆی خۆقوربانی کردنەکەی پێغەمبەر عیسا ڕەتدەکاتەوە کە مەسیحیەکان باوەڕیان پێیەتی. پێغەمبەر عیسا جەختی کردۆتەوە لە بەجێگەیاندنی (١٠) فەرمانەکان تاکو ڕزگاربوون و ژیانێکی هەمیشەیی بەدەست بهێنرێن.

✍..عیسای ناصری "شوێنی منداڵی پێغەمبەر عیسایە" ئەو پیاوەی لەلایەن خواوە هەڵبژێردراوە:-

ئەم چەند دێرەی خوارەوە کە لەئینجیلدا هاتووە ئەو ڕاستیەی قورئان پشتڕاستدەکاتەوە کە عیسا پێغەمبەرێکی پەروەردگارە:-

- "ئەی نەوەی ئیسڕائیل، گوێبگرن لەم وشانە: عیسای ناصری، ئەو پیاوەی لەناو ئێوەدا لەلایەن پەروەردگارەوە هەڵبژێردراوە لەڕێگای دەرئاسا و موعجیزە و نیشانە، کە پەروەردگار هەر لەناو ئێوەدا پیشانی دان لەسەردەستی ئەو، هەروەکو خۆشتان ئەمە ئەزانن."

✍..یەکەم فرمان ئەوەیە کە خوا تاك و تەنیایە:-

ئینجیل هەرگیز باوەڕی مەسیحیەکان بە بوونی سێ خوا بەڕاست دانەناوە. ئەوتا کاتێك یەکێك لەوانەی کە ئینجیلی نووسیوەتەوە لە پێغەمبەر عیسا ئەپرسێت کە یەکەمین فرمان چیە لە (١٠) فرمانەکان، پێغەمبەر عیساش تاڕادەیەك هەمان شت دەڵێت کە موسا پێغەمبەر پێشتر وتوویەتی کە:-

- "ئەی نەوەی ئیسرائیل گوێبگرن، خوا، خوای ئێمە تاکە و یەك خوایە." "مەرقس ١٢- ٢٩"

# چەمکی خوا لەئاینی ئیسلام

ئیسلام کە یەکێکە لە ئاینی سامیەکان کە زیاتر لە (۱.۲) بلیۆن شوێنکەوتووی هەیە لە سەرتاپای جیهاندا. ئیسلام بەمانای ملکەچ بوون دێت بۆ ویست و فەرمانەکانی "الله". موسڵمانان قورئان بە وتەی پەروەردگار ئەزانن کە بۆ پێغەمبەر (محمد)ی ﷺ ناردووە. ئیسلام ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە "الله" پێغەمبەر و پەیامبەرانی بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ ناردووە کە هەموویان یەك پەیامیان پێبووە بۆ مرۆڤایەتی، کە ئەویش باوەڕبوونە بە یەکتایی خوا و بەرپرسیارتی ڕۆژی دوایی. هەرلەبەر ئەمەشە کە ئیسلام بڕوابوونی بە پێغەمبەرانی پێشووی کردۆتە بەشێك لە ئیمان، لەو پێغەمبەرانەش (ئادەم، نوح، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یعقوب، موسا، داود، عیسا و پێغەمبەرانی تر).

✍.. وردترین پێناسەی خوا:-

ووردترین پێناسە بۆ چەمکی خوا لەئیسلامدا هاتووە، ئەویش هەر چوارەکەی ئایەتەکەی سوڕەتی (الإخلاص)ە. پەروەردگار بەم شێوەیە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾﴾ (الإخلاص)

وشـەی (الصَّـمَدُ) هەنـدێك زەحمـەت بـۆ وەرگێـڕان. ئـەم وشـەیە بـەمانا "بوونی ڕەها" دێت، کە ئەمەش سیفەتێکە تایبەتمەندە بە پەروەردگار و تـەنها ئـەتوانرێت بدرێتـە پـاڵ ئـەو چـونکە سـەرجەم بوونـەکانی تـر پەیوەستدارە بە کات و شوێن و مەرجدارن. لەلایەکی ترەوە ئەم وشەیە بەمانای ئـەوە دێـت کە پـەروەردگار نیازمەنـدی بـەهیچ کەسێك یـاخود شتێك نیە، بەڵکو ئەوە کەسـەکان و شتەکانن کە پێویستیان بە خـودا هەیە و پشتی پێدەبەستن.

✍..سوڕەتی (الإخلاص) – پێوەری ئاینزانی:-

سـوڕەتی (الإخـلاص) کـە سـوڕەتی ژمـارە (١١٢)ە لـە قوڕئـانی پـیرۆز پێـوەرە بـۆ زانسـتی ئـاینزانی(Theology) . وشـەی (Theo) لـەزمانی یۆنانیـدا بـەمانای "خـوا" دێـت، هـەروەها وشـەی (logy) بـەمانای بەمانای ناسین یاخود لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوە دێـت. بەمشێوەیەش (Theology) واتای زانستی ناسین و زانینی ئاینـەکان دەگەیـەنێت. بۆ موسڵمانان ئایەتەکانی ئەم سوڕەتە بەسن تـاکو ببنـە پێـوەری ناسینی خوا. هەرکەسێك بانگەشەی خوایەتی بکات پێویستە لە تاقیکردنـەوە یەکلایکەرەوەکـەی ئـەم سـوڕەتە سـەربکەوێت و ئـەو تایبەتمەندیانـەی تێدابێت، چونکە ئەو تایبەتمەندیانەی کەلەم سوڕەتە باسکراون تـاك و

بێوێنـەن. بۆیـەش هـەموو خوایـە سـاختەکان و ئەوانـەی بانگەشـەی خوایەتی دەکەن هەرزوو ئاشکرا ئەبن لەژێر ڕووناکی ئەم سوڕەتە.

✍..بۆچوونی ئیسلام دەربارەی بوونی مرۆڤێك کەخوا بێت:-

هیندستان زۆرجار بە نیشتیمانی مرۆڤە خوایەکان ناودەبرێت، ئەمەش بـەهۆی ئـەو ژمـارەی زۆری ڕابـەرە ڕۆحیـەکان کـە لەوێـدا هـەن، کـە هەریـەکێك لەوپیاوەگـەورە و ئاینیانـە ژمارەیـەکی زۆر شـوێنکەوتوویان هەیە لەزۆرێك لە وڵاتەکان. ئیسلام هەموو بانگەشەیەك بۆ بەخوادانانی مـرۆڤ ڕەتدەکاتـەوە. جـا بـۆ ئـەوەی لـە هەڵوێسـتی ئیسـلام تێبگـەین بەرامبەر ئەوانەی خۆیان بەخوا دادەنێن، بابێین و لەیەکێك لەو کەسانە بکۆڵینـەوە کـە ئـەویش "ئۆشـۆ ڕەنجـیش". "ڕەنجـیش" یەکێکـە لـەو ڕابەرە ڕۆحیانەی کە لەهیندستان سەری هەڵدا. لەمانگی (٥)ی ساڵی (١٩٨١) "ئۆشۆ" دەڕواتە ئەمریکا و شارۆچکەیەکی دروستکرد بەناوی "ڕەنجـیش پـورەم"، دواتـر ئـەو لـە ڕۆژئـاوادا کەوتـە نـاو هەڵـەوە و دەستگیرکرا و داوای لێکرا کە ئەمریکا جێبێڵێت. بۆیە ئەو گەڕایەوە بۆ هیندستان و دەستیکرد بە بنیاتنانی کۆمەڵگایەك لە "پوین" کە ئێستا بە "کۆمەڵگای ئۆشۆ" ناسراوە، هەروەها ئۆشۆ لەساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایکرد. شوێنکەوتووانی ئۆشۆ لەوبڕوایـەدان کـە ئۆشـۆ خـوا بـووە.

ئەوانـەی کـە سـەردانەی کۆمەڵگایەکـەی ئۆشـۆ ئەکـەن، لەسـەر کێڵـی گۆڕەکەی ئەم پارچە نووسینە ئەبینن "ئۆشۆ – نە لەدایك بووە، وە نـەمردووە، بـەڵکو ئـەو تـەنها سـەردانی زەوی کـردووە لـەنێوان (١١)ی مـانگی (...) سـاڵی (١٩٣١) تـاکو (١٩)ی مـانگی (...) سـاڵی (١٩٩٠). بـەڵام ئـەوان بـێ ئاگـان لـەوەی کـە ئۆشـۆ لەلایـەن (٢١) وڵاتـەوە فیـزەی پێنـەدراوە، وادیـارە شـوێنکەوتووانی ئۆشـۆ هـیچ کێشـەیەك لـەوەدا نابینن کە خواکەیان پێویستی بە فیزەیە تا بتوانێت بچێتە وڵاتێك لەکاتی سەردانەکەی بۆ زەوی.

ئێسـتاش بابەیەکـەوە ئـەم کەسـە "ئۆشـۆ ڕەنجـیش" کەبـەخوا دانـراوە بخەینە ژێر تاقیکردنەوەی سورەتی (الإخلاص):-

١- یەکەمین پێوەر دەڵێت "بڵێ، ئەو ، (الله) تاك و تەنیایە". باشە ئایا ڕەنجیش تاك و تەنیا بوو؟ بێگومان نەخێر چونکە زۆرانێکی تر هەبوون کە بانگەشەی خوایەتیان کردووە. کەچـی هەنـدێك لـە شـوێنکەوتووانی ئۆشۆ ڕەنگە ئێستاش بڵێن کە ئەو تاك وتەنیا بوو.

٢- دووەم پێوەر دەڵێت "پەروەردگار بێ نیازە و جێی نیاز و ئومێدە و زاتێکی نەمرە". ڕەنجیش بەهیچ شێوەیەك بێ نیاز و خـاوەن بـوونێکی ئەبـەدی نـەبوو، چـونکە ئـەوتا لەسـاڵی (١٩٩٠) کۆچـی دوایـی دەکـات.

لەژیانی ئەودا ئەوە دەبینرێت کە ئۆشۆ نەخۆشی شەکرە و تەنگەنەفەسی و پشت ئێشەی درێژخایەنی هەبووە. ئۆشۆ ئەوەشی دووپات کردۆتەوە کەوا حکومەتی ئەمریکا لە زینداندا ژەهر خواردیان کردووە. بهێنە پێش چاوی خۆت خوایەکی بەهێز و دەسەڵات ژەهرخوارد بکرێت. بۆیە ناکرێت ڕەنجیش بێ نیاز و خاوەنی بوونێکی نەمر بووبێت.

٣- سێیەمین پێوەر بریتیە لە "کەسی لێ نەبووە و، وە لەکەسیش نەبووە" کەچی ئێمە ئەزانین کەوا ڕەنجیش لە "جەبلپور" لەدایك بووە. ئەو دایکی و باوکی هەبووە و باوکیشی دواتر بووتە یەکێك لە شوێنکەوتووانی.

٤- چوارەمین پێوەر سەختە و دژوارتر چونکە ئەڵێت "ئەو خوایە هیچ هاوشێوەیەکی نیە". هەرلەگەڵ وێنەکردنی خوا یاخود بەراوردکردنی خوا بە شتانی تر ئەوە ڕاستەوخۆ بزانە کە ئەوە خوا نیە، چونکە هەرگیز ناتوانرێت وێنەی زاتی پەروەردگاری تاك و تەنیا لە زهنی خۆماندا بکەین. کەچی ئێمە ئەزانین ڕەنجیش ڕیشێکی سپی شۆڕەوەبووی هەبوو. ئەو دوو گوێ و دووچاو و یەك لووت و یەك زاری هەبوو. وێنە و پۆستەری ڕەنجیش بێ ژمارە هەن. بۆیە ئەوکاتەی کە توانیت وێنەی خوا بکەیت ئەوە بزانە ئەو شتە خوا نیە.

**✍..موسوڵمانان بەچی ناوێك خوا ناودەنێن یاخود بانگ دەکەن؟:-**

**موسڵمانان وابەباش دەزانن کە خودا بەناوی "الله" بانگ بکەن، نەك بەناوی ئینگلیزیەکە (God) کەبەمانای خوا دێت. ناوی "الله" ناوێکی تاك و بێ وێنەیە و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، بەپێچەوانەی ناوە ئینگلیزیەکە کە دەتوانرێت گۆڕانکاری بەسەردا بێت. بەگوێرەی ناوەڕۆکی نووسینەکە یاخود قسەکان.ئەگەر "S"ی کۆکردنەوە زیادبکەین بۆ ناوی "God" ئەوکات دەبێتە "Gods" کەواتای خواکان دەگەیەنێت کە ئەمەش ناوی کۆیە بۆ خودا. بەڵام ناتوانرێت هەمان شت بەسەر ناوی "الله" بکرێت بکرێتە کۆ چونکە ناوێکی تاك و بێ وێنەیە. لەلایەکی ترەوە ئەگەر پاشگری "dess" زیادبکەین بۆ ناوی "God" ئەوکات دەبێتە "Goddess" کەبەمانای خوای مێینە دێت. ئەمە لەکاتێکدا هیچ شتێکی وەکو خوای نێرینە یان خوای مێینە ناتوانرێت بکرێت لەگەڵ ناوی "الله" چونکە ناوی "الله" هیچ ڕەگەزێکی نیە. لەلایەکی ترەوە ئەگەر پێشگری "Tin" بخەینە پێش ناوی "God" ئەوە ئەبێتە "Tin-God" کەبەمانای خوای درۆینە یاخود ساختە دێت. بەپێچەوانەوە ناوی "الله" ناوێکی بێ هاوتایە کە ناتوانرێت وێنەی بۆ بکرێت یاخود دەستکاری بکرێت و ماناکەی**

بگۆڕدرێت. هەربۆیەش موسڵمانان وابەباش ئەزانن ناوی "الله" بەکاربهێنن، بەڵام هەندێکجار کە لەگەڵ کەسێکی غەیرە موسڵمان ئەدوێین وشەی خوا یاخود پەروەردگار بەکاردێنین. جا لەبەر ئەوەی ئەم پەڕتووکە بۆ موسڵمان و ئەوانەشی کە موسڵمان نین نوسراوەتەوە، ئەوە من وشەی خوا یان پەروەردگارم بەکارهێناوە لەزۆر شوێنی ئەم پەڕتووکە[1].

✍..خودا نابێتە مرۆڤ:-

هەندێك کەس دەپرسن ئەگەر خوا ئەتوانێت هەموو شتێك بکات کەواتە بۆناتوانێت خۆی بخاتە شێوە یاخود وێنەی مرۆڤەوە؟. ئەگەر خودا بیەوێت ئەوە ئەتوانێت خۆی بخاتە شێوەی مرۆڤ بەڵام ئەمە مانای وایە کە ئەو چیتر نابێتەوە خوا چونکە تایبەتمەندیەکانی خوا و مرۆڤ تەواو لەیەك جیاوازن. ئەم چەند ڕاستیە خوارەوە پڕوپووچی ئەو بیرۆکەیە دەردەخات کە دەپرسێت کە بۆچی خوا خۆی ناخاتە سەر شێوەی مرۆڤەوە:-

---

[1] تێبینی/ ئەم باسکردنەی ناوی ( الله ) ، لە ڕووی زمانەکانی عەرەبییەوە تەواو نییە، چونکە وشەی ( الله ) لە ( ال ، إلە ) ەوە وەرگیراوە و پاشان ( إ ) حذف بووە و بووەتە ( ال ، لە ) – ( اللە ) و بۆ مەزنیش بەقەڵەوی دەخوێنرێتەوە . وە عەرەبە کۆنەکان بتێکیان هەبووە بەناوی ( اللاة ) کە بە ( مؤنثی )ی وشەی ( الله )یان دەزانی – پەنا بەخوا – ( ڕێنوێن )

خودا نەمر و هەمیشەییە ئەمە لەکاتێکدا مرۆڤ نەمر نیە و دەمرێت. ناکرێت مرۆڤێکی خوایینە هەبێت کە لەیەك کاتدا هەم نەمر بێت و هەم سەرتا و کۆتای هەبێت، چونکە ئەمە شتێکە دوورە لە ژیری. خودا سەرەتایەکی نیە بەلآم مرۆڤ سەرتایەکی هەیە. ئێمە ناتوانین کە مرۆڤێك بدۆزینەوە کە لەیەك کاتدا هەم سەرتایەکی هەبێت هەمیش سەرەتای نەبێت. هەروەها مرۆڤەکان کۆتاییەکیان هەیە. ئێمە هەرگیز ناتوانین مرۆڤێك بدۆزینەوە کە لەیەك کاتدا کۆتاییەکی هەبێت هەمیش کۆتایی نەبێت.بەڕاستی ئەمە باوەڕێکی پڕوپووچە.

پەروەردگار پێویستی بە خواردن و خواردنەوە نیە کەچی مرۆڤەکان پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە هەیە تاکو زیندوو بمێننەوە :

﴿... وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ... ﴿١٤﴾﴾ (الأنعام )"

هەروەها پەروەردگار نە ئەخەوێت وە نە پێویستی بە پشوودان هەیە، ئەمەلەکاتێکدا مرۆڤەکان پێویستیان بە خەوتن و پشوودان هەیە:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾﴾ ( البقرة )"

✍..بەندایەتی کردنی مرۆڤێکی تر کارێکی پڕوپووچە:-

ئەگەر وادابنێین کە خودا مرۆڤێك بێت ئەوکات پێویستە دان بەوەشدا بنێین کە بەندایەتی کردنی مرۆڤێکە تر بێ مانا و پڕوپووچ ئەبێت. ئەگەر خودا خۆی خستە شێوەی مرۆڤێك ئەوکات ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو دەستی هەڵگرتووە لەخوایەتی و هەموو تایبەتمەندیەکانی مرۆڤی وەرگرتووە. بۆنموونە ئەگەر هاتوو پرۆفیسۆرێکی لێهاتوو تووشی ڕووداوێك هات و بەهۆیەوە تووشی نەخۆشی بیرچوونەوە بێت، ئەوکات زۆر گەوجانە ئەبێت بۆ قوتابیەکانی کە لای ئەو بخوێنن و بەردەوامی بدەن بە فێربوون لە وانەکانی ئەودا.

بەهەمان شێوە ئەگەر خودا بچێتە سەرشێوەی مرۆڤ ئەوکات ناتونێت ببێتەوە بە خودا چونکە هەروەك زۆر ڕوون و ئاشکرایە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ببێتە خوا.هەربۆیەش باوەڕبوون بە بوونی خوا لەسەر شێوەی مرۆڤ لێکدانەوە و باوەڕێکی هەڵەیە و نەخوازراوە.

هەربۆیەش قورئان هەموو جۆرە بیرۆکەیەکی دانانی مرۆڤ وەکو خوا ڕەتدەکاتەوە. ئەوتا قورئان بەم شێوەیە ئەدوێت:

﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ...﴾ ( الشورى )"

✍..خودا کارێك ناکات کەشیاوی خوایەتی نەبێت:-

ئەو سیفەتانەی پەروەردگار هەیەتی دوورن لەهەموو جۆرە کارێکی ناڕێك و هەڵە چونکە پەروەردگار هەر خۆی سەرچاوەی دادپەروەری و بەزەیی و حەقە. هەرلەبەرئەمەشە ناکرێت بیرلەوە بکەینەوە ك خودا کارێك بکات نەشیاو بێت بۆ خوایەتی. نابێت ئەوە بەمێشکماندا بێت کە پەروەردگار درۆبکات، نادادپەروەر بێت، هەڵەبکات و شتی بیربچێتەوە یاخود ئەو هەلأنەی کە مرۆڤ دەیکات. هەرچەندە پەروەردگار ئەگەر بیەوێت دەتوانێت نادادپەروەر بێت بەلأم هەرگیز ئەم کارە ناکات چونکە کارێکە ناشیاوی خوایەتیە. قوڕئان بەم شێوەیە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ... ﴿٤٠﴾ ﴾ ( النساء )"

پەروەردگار ئەگەر بیەوێت ئەتوانێت نادادپەروەری بکات بەلأم هەرئەوکاتەی کە نادادپەروەری دەکات ئەوە دەستی لەخوایەتی هەڵگرتووە.

✍..خودا هەرگیز شتی بیرناچێتەوە و هەڵەناکات:-

پەروەردگار هیچ کات شتی بیرناچێتەوە چونکە بیرچوونە کارێکە ناشیاوە بۆ خوایەتی و بەشێکە لە کەموکوڕتیەکانی مرۆڤ. بەهەمان شێوە پەروەردگار هەڵەناکات چونکە هەڵەکردنیش گونجاو نیە بۆ خوایەتی پەروەردگار: ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ﴾ ( طه )"

**✍..پەوەردگار كارێك دەكات شیاوی خوایەتی بێت:-**

**پـەروەردگار توانـاداره بەسـەر هەمووشـتێك. لێكدانـەوەی ئیسـلام بـۆ چـەمكی خـوا ئەوەیـە كـە خـوا زاتێكـە تونـاداره بەسـەر هەمووشـتێكدا ودەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێكدا ئەشكێت. قوڕئان لەزۆر شوێنیدا ئـەم ڕاستیەی دووپات دەكاتەوە لەم چەند ئایەتە هاتووە:-**

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾﴾ (البقرة)

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾﴾ (البقرة)

﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾ (البقرة)

﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾﴾ (آل عمران)

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾﴾ (النحل)

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾ (فاطر)

**هەروەها قوڕئان لە شوێنكی تریدا وا ئەفەرمووێت:**

﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾﴾ (البروج)

**ئەوەی لێرە پەروەردگار مەبەستیەتی لەكردنی ئەو كارانەیە كە شیاوی خوایەتیە نەوەك ئەوانەی كە ناشیاوی خوایەتین.**

**زۆرێك لەئاینـەكان تاڕادەیـەك جـا ڕاسـتەوخۆ بێـت یـاخود ناڕاسـتەوخۆ بڕوایان بە فەلسەفەی بوونی خوا لەسەر شێوەی مرۆڤ هەیە. ئـەوان لـەو**

بڕوایەدان کەوا خودا ئەوەندە پاك و بێگەرد و پیرۆزە کە بێ ئاگایە لە زەحمەت و کەم و کورتیی و هەستەکانی مرۆڤ، جا بۆ ئەوەی یاسا و شەریعەت بۆ مرۆڤەکان دابنێ ناچار بووە خۆی بخاتە سەرشێوەی مرۆڤ. ئەم باوەڕ هەڵخەڵەتێنەرە ملیۆنان خەڵکی هەڵخەڵەتاندووە. کەوتا بابێن و ئەم باوەڕە شرۆڤە بکەین و بزانین ئەم باوەڕ تا چەند ئەگونجێت لەگەڵ ژیری مرۆڤ؟.

✍..بەدیهێنەر نامیلکەیەکی ڕێنمایی ئامادە دەکات:-

"الله" مرۆڤی خەڵاتکردووە بەوەی کە ژیری و تێگەیشتنی پێداوە. ئێمەی مرۆڤ بەو هۆیەوە ئامێر بۆ هۆکاری جیاواز دادەهێنین و بەرهەم دێنین. تۆمارە دەنگیەکان کە یەکێکە لەو بەرهەمانە و ژمارەیەکی زۆری لێ بەرهەم دێت، بەڵام هیچ کاتێك ناوترێت بۆ ئەوەی بزانین چی باشە بۆ تۆمارە دەنگیەکان ئەوە پێویستە خۆمان بخەینە سەرشێوەی تۆمارێکی دەنگی. ئێمە ئەوەش دەزانین کە لایەنی بەرهەمهێنەر هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی نامیلکەیەکی ڕێنمای لەگەڵ بەرهەمەکەی کە زانیاری تەواو و ووردی تێدایە لەسەر تۆمارە دەنگیەکە. ئەم نامیلکە ڕێنماییە سەرجەم ئەو شتانەی کە دەکرێت بکرێت و ئەو شتانەشی کە نابێت بکرێت. ئیستاش ئەگەر بێت و

سەیری مرۆڤ بکەین وەکو ئامێرێك، ئەوە بێگومان دەبینین کە ئاڵۆزترین دروستکراوی "الله"یە. پەروەردگاری بەدیهێنەر "الله" هەرگیز پێویستی بەوە نیە خۆی بخاتە سەر شێوەی مرۆڤ تاکو بزانێت چی باشە یاخود چی خراپە بۆ مرۆڤ. ئەوەی کە پێویستە ئەوەیە کە پەروەردگار نامیلکەیەکی ڕێنمای بنێرێت بۆ مرۆڤەکان. قورئانیش لە حکومی ئەو نامیلکەیە ڕێنماییە بۆ مرۆڤەکان. نەر هەر ئەوەندە بگرە پەروەردگار لەڕۆژی دوایدا مرۆڤەکان هەر هەموویان کۆدەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە، کەئەمەش بەتەواوی قەبوڵکراوە لەگەڵ ژیری چونکە پەروەردگار هەموو ئەو شتانەی کە دەکرێت بکرێن و ئەو شتانەشی کە نابێت بکرێن لەو نامیلکە ڕێنماییە "قورئان" ڕوونکردۆتەوە.

.. "الله" پەروەردگار پێغەمبەران هەڵدەبژێرێت:-

"الله" پێویستی بەوە نەبوو کە خۆی بگۆڕێت سەرشێوەی مرۆڤ و بێتە سەر زەوی و نامیلکە ڕێنمایەکە بنووسێتەوە و بلاّبکاتەوە، بەڵکو لەبری ئەمەدا بەدرێژایی ژیان مرۆڤی لەنەتەوەی جیاواز هەڵبژاردووە تا بتوانن ئەو پەیامە خواییە بگەیەننە مرۆڤەکانی تر. بەو مرۆڤە هەڵبژێردراوانە دەوترێت پێغەمبەر و پەیامبەرانی پەروەردگار.

✍.. هەندێك لە مرۆڤەکان کەڕ و کوێرن:-

سەرەڕای پڕوپووچی بیرۆکەی بوونی خوا لەسەرشێوەی مرۆڤ، کەچی زۆرێك لە شوێنکەوتووانی ئاینەکانی تر باوەڕیان پێیەتی و بانگەشەی بۆ دەکەن. پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەمە جۆرێك نیە لە گاڵتەکردن بەو ژیریەی کە پەروەردگار بەمرۆڤی بەخشیوە؟. ئەو جۆرە کەسانەی هەڵگری ئەم باوەڕەن بەڕاستی کەڕ و کوێرن ئەگەرچی پەروەردگار هەستی بیستن و بینینی پێبەخشیون. ئەوەتا قورئان وا باسی ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەکات:-

﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ ( البقرة )

ئینجیلش لە پەڕتووکی " مەتا" هەمان پەیامی پێیە و بەمشێوەیە باس لەو کەسانە ئەکات:-

- "بینینیان هەیە بەڵام نابینن، بیستنیان هەیە بەڵام نابیستن، بەڕاستی ئەوان تێناگەن" " مەتا ١٣: ١٣"

هەمان پەیام ئەتوانرێت ببینرێت لە پەڕتووکی پیرۆزی هیندۆسەکان "ڕیجفێدە" :-

- "ڕەنگە کەسێك هەبێت ئەم وشانە ببینێت کەچی لەڕاستیدا هەر وەکو وابێت نەیبینی بێت، ڕەنگە کەسێکی تر هەبێت ئەم وشانەی

بیستبێت بەڵام لەڕاستیدا هەروەکو وابێت نەیبیست بێت." "ڕیجفێدە ١٠: ١٧: ٤"

هەموو ئەم پەڕتوکە ئاینیانە ئەوە پەیامە ئەگەیەنن کەوا سەرەڕای ڕوونی حەقیقەت و زانینی کەچی کەسانێك هەن لە حەقیقەت و ڕاستی لادەدەن و پشتی تێدەکەن.

## سیفەت و تایبەتمەندیەکانی خوا

قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە دەدەوێت:﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ ( الإسراء : ١١٠ )

هەمان پەیام لەزۆر شوێنی قورئانی پیرۆز دووبارە بووەتەوە دەربارەی نـــاوە جوانـــەکانی "الله" : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ ( الأعراف )

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ ( طه )

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ ( الحشر )

لـــە فـــەرموودەی پێغەمبـــەری خـــوادا (ﷺ) (٩٩) نـــاو و ســـیفەتی باسکردووە لە ناوە و سیفەتەکانی پەروەردگاری مەزن. وە لەسەرووی هەمووشیانەوە ناوی "الله" دێت. قورئان وەسفی "الله" دەکات بە "الرحمن، الرحیم، الحکیم" و ناوەکانی تریش. مرۆڤ ئەتوانێت بەهەر ناوێك بانگی پەروەردار بکات بەڵام بەومەرجەی پێویستە ئەو ناوە جوان بێت و وێنەیەك لەمێشکدا دروست نەکات.

✍.. هەموو ناو سیفەتەکانی خوا تاك و بێ وێنەن و هەرخۆی خاوەنی ئەو ناوانەیە:-

نەك هەرئەوەی کە پەوەردگار خاوەنی ئەو ناو سیفەتە بێ وێنانەیە، هـەموو ئـەو نـاو و سیفەتانە زۆر بـەجوانی و ڕیـك و پێکـی وەسـفی پـــەروەردگار دەکـــەن. ئێســـتاش بـــابێین ئـــەم خاڵـــە بەدرێـــژی ڕوونبکەینـــەوە،با ئێســـتاش کەســـایەتیەکی بـــەناوبانگ بەنموونـــە وەربگرین، بۆ نموونەنیل ئارمسترۆنگ. ئەگەر کەسێك بێت و بڵێت نیل ئارمسترۆنگ خەڵکی ئەمریکایە، ئەوکات سیفەتی خەڵکی ئەمریکا ڕاست و دروستە بەڵام سیفەتێکە کە بەتەنها بەس نیە تا نیل ئارمسترۆنگی پێ بناسرێتەوە. هەروەها نیل ئارمسترۆنگ کەسێکی ئاسمانکەڕ بوو. سیفەتی ئاسمانکەڕیش بۆ نیل ئارمسترۆنگ دروستە

بەڵاو ئەویش تەنها پەویست نیە بە نیل ئارمسترۆنگ و کەسانی تری ئاسمانگەڕ هەن. جا بۆ ئەوەی کەسێك بناسینەوە پێویستە بگەڕێین بۆ سیفەت و ناوێکی تاك و بی وێنە، بۆ نموونە نیل ئارمسترۆنگ یەکەم کەس بوو کە بتوانێت بچێتە سەر مانگ. بۆیە کاتێك کەسێك دەپرسێت کێ یەکەم کەس بوو چووە سەر مانگ ئەوکات تەنها یەکەم وەڵامان پێدەبێت بۆ ئەم پرسیارە ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسە نیل ئارمسترۆنگە. بەهەمان شێوە سیفەتەکانی خودا پێویستە تاك و تەنها و بێ وێنە بن بۆ نموونە بەدیهێنەری گەردوون. ئەگەر من بڵێم دروستکەری باڵەخانەیەك، ئەمە شتێکە ئەگونجێت و دروستە بەڵام تاك و بێ وێنە نیە چونکە هەزاران کەسی تر هەن کە باڵەخانە دروستدەکەن، بۆ یە ئەوکات هیچ جیاوازیك لە نێوان خوا و مرۆڤدا نابێت. بەڵام ناو وسیفەتە جوانەکانی خوا تەنها بۆ خودان و بێ وێنەن و بۆ کەسی تر نابن. بۆ نموونە:-

* الرحيم: بەبەزەیی
* الرحمن: میهرەبان
* الحكيم: زانا

بۆیـه کاتێـك یـەکێك دەپرسـێت "الـرحیم" کێیـه؟ ئـەوکات تـەنها یـەك وەڵامان پێیه کە ئەویش ئەوەیە بڵێن زاتی "الله"یە.

✍ .. سیفەت و ناوەکانی خوا نابێت دژ و پێچەوانەی یەکتر بن:-

ئێسـتاش بـا هـەر نموونەکـەی پێشـوو (نیـل ئارمسـترۆنگ) بەکاربهێنینەوە. ئەگەر کەسێك بڵێت نیل ئارمسترۆنگ ئاسمانگەڕێکی ئەمریکی بوو کە درێژی باڵای بەئەندازەی چوار پێ بوو. بەڵێ سیفەتی ئاسمانگەڕێکی ئەمریکی ڕاست و دروستە بەڵام سیفەتەکەی تر هەڵەیە و دوورە لـە ڕاسـتی. بەهـەمان شـێوە ئەگـەر کەسـێك بڵێـت "الله" دروستکاری هەموو گەردوونە کە خاوەنی یەك سەر و دوو دەست و دوو پێ یە. ئەوکات سیفەتی" دروستکاری هەموو گەردوون" ڕاستە و درووستە بەڵام سیفەتەکانی تر کە لەشێوەی مرۆڤێك بکات هەڵەیە و دوورە لە ڕاستی.

✍ .. سیفەت و ناوەکان پێویستە ئاماژە بکەن بۆ یەك خوا:-

لەبەرئەوەی تەنها یەك خوا هەیە بۆیە سەرجەم سیفەت و ناوەکان پێویسـتە ئامـاژە بکـەن بـۆ یـەك خـوا. بـابڵێین نیـل ئارمسـترۆنگ ئاسمەنگەڕێکی ئەمریکی بوو کە بەیەکەم کەس دادەنرێت کە چووبێتە سەرمانگ، بەڵام وتنی ئەوەی دووەم ئیدرین ئاڵدرینە هەڵەیە. بەهەمان

شـێوە ئەگـەر بێـت و بڵـێین بەدیهێنـەر خـوای تـاك و تەنیایـە و "الحـافظ"یـش خوایـەکی تـرە، ئـەوکات ئـەم قسـەیە تـەواو هەڵـە و گاڵتەجاریانەیە،چونکە تەنها یەك خوا هەیە کەخاوەنی هەموو ئەو ناو وسیفەتانە بێت.

✍ .. یەکتایی خودا:-

هەندێك لەوانەی کە باوەڕیان بە بوونی زیاتر لە یەك خوا هەیە پێیان وایە باوەڕبوون بە بوونی زیاتر لەیەك خوا پێچەوانەی ژیری نیە و باوەڕێکە شیاوی باوەڕپێکردنە. با ئێستاش ئەوەیان بۆ ڕوونبکەینەوە ئەگەر زیاتر لەیەك خوا بوونی هەبێت ئەوە ئەوکات لەگەڵ یەکتر مشتومڕ و تووشی ناکۆکی دەبن لەوەی کە هەر خوایەك دەیەوێت ویست و دەسەڵاتی خۆی زاڵ بکات بەسەر ئەوانی تر. ئەمەش زۆر بەئاسانی هەستی پێدەکرێت لە باوەڕ ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی زیاتر لەیەك خوا هەیە. وادابنێ ئەگەر یەکێك لەوخوایانە شکست بخوات یاخود نەتوانێت شکست بە خواکای تر بهێنێت کەواتە لەڕاستیدا ئەوە خوای ڕاستەقینە نیە.ئەوەی زۆر باوە لە بیروباوەڕی بوونی زیاتر لەیەك خوا ئەوەیە کە هەریەکێك لە خوایەکان بەرپرسیاریەتیەکی هەیە. هەریەکێکیان بەرپرسیارە لەلایەنێکی ژیانی

مرۆڤەکان وەکوخوای خۆر و خوای باران و هتد. ئەمەش لەڕاستیدا ئەوە دەردەخات کە یەکێك لەخوایەکان دەستەوەستانە لەکردنی هەندێك شت و بێ ئاگایە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی خوایەکانی تر. بۆیە هەرگیز ناکرێت خوایەکی بێ ئاگا و بێ توانا هەبێت. لەلایەکی ترەوە ئەگەر زیاتر لەیەك خوا هەبێت ئەوکات گەردوون تێکچوون و ئاڵۆزی و ناڕێکی بەخۆیەوە دەبینێت، کەچی گەردوون وا لە ڕێکی و ئارامیەکی تەواودایە. قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە ئەدوێت:﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ ( الأنبياء )

ئەگەر زیاتر لەیەك خوا هەبووایە ئەوە ئەوکات ئەوەی دروستیان کردووە و بەدی هێناوە، هەر خۆیان لەناویان دەبرد. لە قورئانی پیرۆزدا واهاتووە:﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَـٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَـٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ ( المؤمنون )

کەواتا بێگومان تەنها باوەڕکردن بەبوونی یەك خوای خاوەن دەسەڵات باوەڕێکی لۆژیکی و واقیعیە و لەگەڵ ژیری مرۆڤدا دەگونجێت.

ژمارەیەکی کەم لە ئاینەکانی تری وەکو بودیزم و کۆنفۆشیزم کە بەئاینی "Agnostic" کەوا ئاینێکن ڕاوبۆچوونی خۆیان لەسەر خوا

دەرناخەن. ئەوان نەئەوەتا بوونی خوا بەڕاست دابنێن وە نەئەوەتا بوونی خوا ڕەتبکەنەوە. هەندێك باوەڕی تریش هەن وەکو "Jainism" ك باوەڕێکی "ئیلحاد"یە و باوەڕی بەبوونی هیچ خوایەك نیە.

پشت بەخوا لەداهاتوودا پەڕتووکێك بڵاودەکەمەوە لەژێر ناوی "ئایا قورئان وتەی خودایە؟"، کە تێیدا بوونی خودا ئەسەلمێنم بۆ ملحیدێك یاخود کەسێك کە گومانی لەبوونی خوا هەبێت، وە سەلماندنەکەش لەڕێگای ژیری و زانست و لۆژیکەوە ئەبێت بەپشت بەستن بەقورئانی پیرۆز.

✍ .. هەموو ئاینەکان دواجار بڕوایان بە یەکتاپەرستی هەیە:-

هەموو ئاینەکان لەوانەی بڕوایان بە بوونی خوا هەیە لەکۆتایدا بڕوایان بەبوونی یەك خوای تاك و تەنهای باڵادەست هەیە. لەڕاستیدا زۆرێك لە پەڕتووکە ئاسمانیەکان باس لەیەکتاپەرستی دەکەن.

✍ .. مرۆڤەکان پەڕتووکە ئاسمانیەکان دەگۆڕن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان:-

بەتێپەڕبوونی کات زۆرێك لە پەڕتووکە ئاسمانیەکان شێوێندران و گۆڕانیان تێداکرا لەلایەن مرۆڤەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوو، هەربۆیەش ڕێچکەی زۆرێك لەو ئاینە شوێندراوانە لە باوەڕی

یەکتاپەرستی و بوونی یەك خوا بۆ باوەڕبوون بە کۆمەڵ خوایەك .

قورئانی پیرۆز لەشوێنێکدا وا ئەفەرموێت:

﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ ( البقرة )

.. التوحید (یەکتاپەرستی):-

- پێناسە و بەشەکانی:- ئیسلام باوەڕی بە "توحید" هەیە کە مانای یەکتاپەرستی ئەگەیەنێت کە هەر ئەوە باوەڕی یەکتاپەرستیە نیە کە ئاینەکانی تر هەیانە، بەڵکو باوەڕی ئیسلام زیاترە لەوە. وشەی "توحید" بەمانای یەکبوون یاخود بوون بە یەك هەروەك ڕوونە ئەم وشەیە "توحید" وەرگیراوە لە فرمانی "وحده" کە مانای بوونە یەك دێت.

"توحید" دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر یاخود بەش، کە ئەوانیش:-

١- توحید الربوبیە.

٢- توحید الأسماء و الصفات.

٣- توحید العبادە.

١/ توحيد الربوبيه (يەکتاپەرستی لە بوونی خوا):-

یەکەمین جۆری "توحید" پێی دەوترێت " توحيد الربوبيە". وشەی "الربوبيە" وەرگیراوە لە ڕەگی "رب" کە بەمانای خوا یان پەروەردگار یان ڕۆزیدەر دێت. هەربۆیەش " توحيد الربوبيە" مانای باوەڕبوونە بە بوونی یەك خوا. ئەم جۆرەی "توحید" لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە کە تەنها "الله" هۆکاری بەدیهێنانە هەموو شتەکانە. هەر ئەو بەتەنها لەنەبوونەوە شتانەکانی هێناوەتە بوون. هەر ئەو بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و هەڵسوڕێنەری هەموو گەردوون و ئەوەی لەناویدایە، ئەو نیازمەندی هیچ شتێك یاخود کەسێك نیە بەڵکو بەپێچەوانەوە هەموو شت و کەسەکان پێویستیان بە ئەو هەیە.

٢/ توحيد الاسما و الصفات (یەکتاپەرستی لە ناو و سیفەتەکانی الله):-

دووەم جۆری " توحید" بریتیە لە " توحيد الأسماء و الصفات " کە بەمانای باوەڕبوونە بە هەموو ناوە جوانەکانی پەروەردگار. ئەم جۆرەی " توحید" دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش:-

- پەروەردگار پێویستە بەو شێوەیە وەسفبکرێت کە خوا و پێغەمبەر کردویانە:-

پێویستە بەو شێوازەی کە لە قورئاندا هاتووە یاخود پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی خوایان کردووە، ئێمەش وەسفی خوا بکەین. نابێت شتێک زیاد بکەین یاخود کەم بکەین بۆسەر ئەو مانایەی کە هەریەکێک لەناو و سیفەتەکانی خوا هەیەتی.

- ئاماژە کردن و باسکردنی پەروەردگار بەو شێوە دەبێت کە خۆی کردوویەتی:-

ئێمە ناتوانین هیچ ناوێك یاخود سیفەتێکی تر زیادبکەین بۆ ئەو ناو وسیفەتانەی کە پەروەردگار بۆ خۆی داناون و خۆی بەهۆیانەوە پێناساندووین. بۆ نموونە ناتوانرێت زاتی "الله" بە "الغاضب" بانگ بکرێت، هەرچەندە خۆی باسیکردوو لە قورئان کە ئەوتوڕە دەبێت و هەندێکجار توڕەبوونی خۆی بەسەر خەڵکانی تاوانبار دەڕێژێت، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەو ناوە بەکارناهێنین چونکە پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) بەکاریان نەهێناوە.

- هیچ کات سیفەت و ناوەکانی پەروەردگار ناچوێنین بە سیفەتی مرۆڤەکان:-

کاتێك باس لە خوا دەکەین یاخود ئاماژە بە ناو وسیفەتەکانی دەدەین دەبێت خۆ بەدوور بگرین لە بەراوردکرن و چواندنی بە مرۆڤەکان. بۆ

نموونە لەئینجیلدا وێنەی پەروەردگار واکراوە کە داوای لێخۆشبوون دەکات لەو کارە هەڵانەی کە ئەیکات هەروەکو چۆن مرۆڤ داوای لێبوردن دەکەن کاتێك هەڵەیەك ەکەن. ئەمەش شتێکە تەواو پێچەوانەی "تەوحید"ە. پەروەردگار هەرگیز داوای لێخۆشبوون ناکات چونکە لەڕاستیدا ئەو هەرگیز هیچ هەڵەیەك ناکات. یەکێك لە بنەما سەرکیەکانی تێگەیشتن لە ناوەکانی پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە، کە ئەویش ئایەتی ژمارە (١١) لەسورەتی (الشوری) :

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾

کاتێك ئێمە بەراوردی ئەوە دەکەین کە پەروەردگار هەیەتی بەوەی کە مرۆڤ هەیەتی پێویستی بزانین جیاوازی گەورە هەیە. بۆ نموونە کاتێك باسی هەستی بیستن و بینین لە مرۆڤدا دەکەین ناتوانین بەراوردی بکەین بەو بیستن و بینینەی کە پەروەردگار هەیەتی.، چونکە هەستی بیستن و بینین لە مرۆڤدا سنووردارە، لەکاتێکدا بیستن و بینینی پەروەردگار ڕەهایە و سنوورێکی نیە.

- نابێت سیفەتەکانی پەروەردگار بدرێتە پاڵ مرۆڤ:-

کاتێك یەکێك لە سیفەتەکانی پەروەردگار دەدەینە پاڵ مرۆڤ ئەوکات ئەم کارە تەواو پێچەوانەی تێگەیشتنی "توحید". بۆ نموونە نابێت

ناکرێت کەسێك بە (نەمر) بانگ بکەین بەوەی نەسەرەتا و نەکۆتای هەیە.

- نابێت ناوەکانی خوا بۆ دروستکراوەکانی بەکار بهێنین:-

هەندێك لە ناوەکانی خوا نەناسراون بۆ نموونە "ڕەئوف"، "رحیم"، ڕێگەیان پێدراوە کە بەکارهێنان لەلایەن مرۆڤەکان هەروەکو چۆن پەروەردگار خۆی بەکاری هێناوە بۆ پێغەمبەران، بەڵام ئەمەش بەو مەرجەی کە پێشگری "عبد"ی بۆ ناوەکان بەکاربهێنین کە مانای "بەندە" دەگەیەنێت، بەمەش ناوەکان دەبنە "عبدالرئوف"، "عبدالرحیم".

٣/ توحید العبادە (یەکتاپەرستی لە پەرستن):-

پێناسە و مانای عبادە :- "توحید العبادە" بەمانای یەکتاپەرەستی دێت لە پەرستش کردن بۆ پەروەردگار. وشەی "عبادە" لەوشەی عەرەبی "عبد" وەرگیراوە کە بەمانای "بەندە" دێت. بەمەش وشەی "عبادە" مانای پەرستن و بەندایەتی ئەدات. بۆ نموونە نوێژکردن یەکێکە لە جۆرەکانی پەرستش بەڵام دەبێت ئەوەش بزاندرێت کە تاکە جۆری پەرستش نیە. چونکە خەڵکانێکی زۆر لێکدانەوە و تێگەیشتنێکی هەڵەیان هەیە بۆ وشەی "عبادە" بەوەی کە تەنها

نوێژەکان دەگرێتەوە، بەڵام چەمکی "عبادە" لە ئیسلامدا زۆر فراوانە کە بەمانای گوێڕایەڵی و ملکەچی و بەندایەتیەکی تەواو دێت. پێویستە ملکەچ و گوێڕایەڵی کردنی سەرجەم ئەو شتانە بین کە فەرمانی پێکردوین بەکردنی و ئەوانەشی کە نەهی کردووە لە کردنی، پێویستە تەواوی پەرستشەکانیش تەنها بۆ زاتی "الله" بکرێن و کەسێکی تر نەکەین بە هاوبەشی.

- هەرسێ بەشەکەی توحید دەبێت وەکو یەك بەجێ بگەیەنرێن:-

ئەگەر هاتوو تەنها باوەڕمان بە دوو جۆری یەکەمی توحید بێت و "توحید العبادە" پشتگوێ بخەین، ئەوکات ئەمە هیچ سودێکی نابێت و بێ کەڵکە. قوڕئان پیرۆز باس لە بێباوەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات کە چۆن باوەڕیان تەنها بە دوو تەوحیدەکەی تر سوودی پێنەگەیاندن و بە بڕوادار لەقەڵەم نەدران. قوڕئانی پیرۆز بەم جۆرە ئەفەرموێت:﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ ( يـــــونس )

هەمان بابەت لە سوڕەتی (الزخرف)دا باسکراوە ، ئەوەتا قوڕئان بە شێوەیە ئەدوێت:﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ ( الزخرف )

بت پەرستەکانی مەککە دەیانزانی کە "الله" بەدیهێنەرە، ڕۆزیدەرە، هەڵسوڕێنەری گەردوونە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەمە نەبوونە موسڵمان چونکە ئەوان بە پەرستنی خوای تر هاوبەشیان بۆ خوا دانابوو. هەربۆیەش پەروەردگار بەدوو ناو وەسفیان دەکات کە ئەوانیش "کافر" واتا "بێ باوەڕ" و هەروەها "مشرك" "هاوبەش دانەر".

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ ( يوسف )

بۆیە "توحيد العباده" "یەکتاپەرستی لە پەرستش" یەکێکە لەلایەنە گرینگەکانی "توحيد" چونکە پەرستش و بەندایەتی کردن تەنها بۆ زاتی "الله" دەکرێت و هەرئەویش پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە.

.. الشرك:-

١- پێناسە: "الشرك" بریتییە لە کەم وکوڕتی لە باوەڕبوون و یەکتاپەرستی لە هەرسێ جۆرەکەی "توحيد"، یاخود بە واتایەکی تر بەهەر سستییەك لە بەجێ گەیاندنی هەر سێ جۆرەکەی توحید دەوترێت "الشرك". هەروەکو ڕوونە وشەی "الشرك" بەمانای "هاوبەش دانان" دێت، لە ئیسلامدا ئەم وشەیە بەمانای هاوبەش دانان دێت بۆ زاتی "الله"، بۆ نموونە بت پەرستی.

**٢- هاوبەش دانان یەکێکە لە گوناهە گەورەکان کە "الله" هەرگیز لێی خۆشنابێت:-**

**لە سورەتی (النساء) پەروەردگار ئاماژەی داوە بە گەورەترین گوناه، کە بەم شێوەیە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾ (النساء)

**هەمان پەیام لەسورەتی (النساء) دووپات کراوەتەوە:-**

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾﴾ (النساء)

**٣- دەرئەنجامی "الشرك" ئاگری دۆزەخ:-**

**قورئانی پیرۆز لە سورەتی (المائدە) بەم جۆرە ئەدوێت:** ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾﴾

**٤- بەندایەتی و ملکەچی کردن جگە لە "الله" بۆ کەسی تر ناکرێت:-**

**ئەوەتا پەروەردگار لەسورەتی (آل‌عمران) بەم شێوەیە ئەفەرموێت:-**

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾

# کۆتایی بەشی یەکەم

**قورئانی پیرۆز بەم جۆرە ئەفەرمووێت:** ﴿ وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ ( الأنعام: ١٠٨)

- ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾ ( لقمان ) ، **واتە: خۆ ئەگەر بەڕاستی هەرچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنووس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندە و ( ببێتە مرەکەف و زانستی و نهێنی دروستکراوەکانی خوا بنووسنەوە )، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری و فەرمانەکانی خوا هەر تەواو نابێت بەڕاستی خوای گەورە بەدەسەڵاتە و دانایە .**

- ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ ﴾ ( الحج )، **واتە: ئەی خەڵکینە: نموونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێی بۆ بگرن :بەڕاستی ئەوانەی کە هاناو هاواریان لێدەکەن لە جیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوەو (یارمەتی یەکتریش بدەن) و ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە، داواکار و داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێدەسەڵاتن .**

# بەشی دووەم:

# "زۆرترین ئەو پرسیارانەی کە ئاراستەی موسوڵمانان دەکرێن"

## ١/ فرەیی "تعدد":-

پرسیار:- بۆچی لەئیسلامدا ڕێگادراوە بەپیاو زیاتر لەیەک ژن بهێنێت ؟ بۆچی ئیسلام فرەیی ڕێپێداوە ؟

وەڵام:-

✍ .. پێناسەی فرەیی " تعدد":-

سیستەمێکی ژنهێنانە کەتێیدا کەسێک زیاتر لەیەک پیاو یاخود ژنی هەیە. فرەیی دابەش دەبێت بۆ دووجۆر، یەکەمین بریتیە لە فرەژنی، کاتێک پیاوێک زیاتر لەیەک ژن مارەدەکات. جۆرەی دوومیش فرەپیاوی، کاتێک ئافرەتێک شوو بە زیاتر لەپیاوێک دەکات. لەئیسلامدا فرەپیاوی بەتەواوی قەدەغەکراوە، لەکاتێکدا فرە ژنیەکی سنووردار ڕێپێدراوە و ئاساییە.

ئێستاش ئەگەڕێینەوە بۆ پرسیارە بنچینەیەکەمان، ئەویش ئەوەیە بۆچی ئیسلام ڕێگای داوە بەپیاو زیاتر لەژنێکی هەبێت؟

✍ .. قورئـــان تاکـــە کتێبـــی ئاسمانیـــە لەهـــەموو جیهانـــدا کـــە دەڵێت"دانەیەك مارەبکە(بخوازە)"

قورئـان تاکـە کتێبـی ئاینیـە لەسـەر ڕووی زەوی کـە ڕایبگەیـەنێت و بڵێت "یەك دانە مارە بکە". هیچ کتێبێکی ئاسمانی دیکە نیە کەفرمان بەپیاو بکات کە یەك ژن مارە بکات. لەهیچ یەکێك لە کتێبە ئایینیەکان جاچ "ڤیدا، ڕامایانا، مەهابهاراتا، گیتا، تەلمود یاخود ئینجیل"، کەس نیـە سـنوورێك بـۆ ژنهێنـان بدۆزێتـەوە. بگـرە بـە گـوێرەی ئـەم کتێبـە ئاسمانیانە پیاو ئەتوانێت بەئارەزووی خۆی و چەندی بیەوێت لـە ژن مارەیبکـات. بـەڵام ئـەوا لـەم کۆتاییانـە بـوو کـە پیـاوە ئایینـەکانی هیندۆسی و کڵێسای مەسیحیەکان ژمارەی ژن مارەکردنیان بۆیەك دانە سنووردار کرد.

زۆرێك لەکەسایەتیە هیندۆسیەکان بەگوێرەی کتێبە ئاسمانیـەکانیان ژمارەیـەکی زۆری ژنیـان هـەبوو. (داشـرەت)ی پاشـا، بـاوکی ڕامـا زیـاتر لەژنێکیان هەبووە. کەیشنا ژمارەیەکی زۆر خێزانی هەبووە.

لەلایـەکی تریشـەوە لەسـەردەمانی سـەرەتادا، پیـاوە مەسـیحیەکان ڕێگایان پێدرابوو بە ئارەزووی خۆیان چەندیان بوێت لە ئافرەت مارەی بکـەن، چـونکە ئـەوکات ئینجیـل هـیچ سـنورێکی دانـەنابوو لەسـەر

ژمارەی ئافرەت مارەکردن. ئەوە لەم چەند سەدەیەی کۆتایی بوو کە کلێسا ژمارەی مارەکردنی ژنی بۆ یەك ئافرەت سنووردار کرد.

فرەژنی بەهەمان شێوە ڕێگەپێدراوە لەئاینی جولەکە. بەگوێرەی ((یاسای حاخامەکان)) پێغەمبەر "ئیبراهیم" سێ ژنی هەبوو، هەروەها پێغەمبەر "سلێمان" سەدان ژنی هەبوو. فرەژنی بەردەوام بوو تاکو حاخام "گێرشوم بین یەهوودە" (۹٦۰-۱۰۳۰) پێش زاینی فرمانێکی بڵاوکردەوە دژی فرەژنی. ئەو خێزانە جوولەکانەی کەلەناو دەوڵەتە ئیسلامیەکان دەژیان بەردەوام بوون لەفرەژنی تاکو ساڵی ۱۹۵۰، ئەوکاتەی کە بزووتنەوەی حاخامە گەورەکان هەڵسان بە دەرکردنی یاسایەك بۆ قەدەغەکردنی فرەژنی و سنووردارکردنی بۆ تەنها یەك ژن.

✍ .. تێبینیەکی گرنگ :-

بەگوێرەی سەرژمێریەکی ساڵی (۱۹۷٥)، هیندۆسەکان زیاتر فرەژنی ئەکەن تاکو موسڵمانەکان. لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی کاروباری ئافرەت لە ئیسلام، کە بڵاوکراوەتەوە لەساڵی (۱۹۷٥)، لە لاپەڕە (٦٦) و (٦٧) ئاماژە بەوە ئەکات کە ڕێژەی فرەژنی لەنێوان ساڵانی (۱۹٥۱ - ۱۹٦۱)، لەناو هیندۆسەکان بریتی بووە لە(٪٥.۰٦)، لەکاتێکدا لەنێو موسڵمانەکان بریتی بووە لە (٪٤.۳۱). ئەبێت ئەوەش بزانین کە

بەگوێرەی یاسای هیندستان تەنها پیاوە موسڵمانەکان بۆیان هەیە زیاتر لە یەك ژن مارەبکەن و بۆ پیاوەکانی دەرەوەی ئاینی ئیسلام قەدەغەیە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەبینین هیندۆسەکان زیاتر لە موسڵمانەکان فرەژنیان کردووە. تا لەم دواییانە هیچ بەربەست و ڕێگرییەك نەمالەبەردەم پیاوە هیندۆسەکان سەبارەت بەژمارەی ئەو ژنانەی مارەی دەکەن. ئەوە لەساڵی ١٩٥٤ بوو کەبزوتنەوەی مارەکردنی هیندۆسەکان داوای بەنایاسایکردنی فرەژنی کردبوو بۆهیندۆسەکان. لەئێستاشدا ئەوە یاسای هیندستانە کە هیندۆسەکانی بەستۆتەوە بە مارەکردنی تەنها یەك ژن نەوەکو کتێبی ئاینی هیندۆسەکان.

بائیستاش بزانین بۆچی ئیسلام ڕێیداوە بە پیاو زیاتر لەیەك ژن مارەبکات.

✍ .. قورئان فرەژنیەکی سنووورداری ڕێگەپێداوە:-

هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێدا ئیسلام تاکە کتێبی ئاینیە لەسەر ڕووی زەوی کە بڵێت"یەك ژن مارەبکە". ناوەڕۆکی ئەم دەستەواژەیە لەئایەتی (٣)ی سوورەتی (النساو)دایە:-

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ ﴾

پێش هاتنە خوارەوەی قورئان هیچ بەربەستێك نەبوو لەسەر فرەژنی، پیاوان ژمارەیەکی زۆر ژنیان مارە ئەکرد، تەنانەت هەندێکیان سەد ژنی تێپەراندبوو. ئیسلام سنووورداری کردووە بۆ چوار و نەیهێشتووە زیاتر لە ئەوەنە بهێنێت. ئیسلام ڕێگایداوە بە پیاو بە مارەکردنی دوو، سێ، چوار ئافرەت بەڵام بەو مەرجەی کە دادپەروەر بێت بەرامبەر هەریەکێکیان و بەیەکسانی تەواوی مافەکانیان پێبدات، ئەوەتا لەسوورەتی (النساء) پەروەردگار وا دەفەرموێت:﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ... ﴾( النساء :١٢٩)

بۆیە فرەژنی یاسایەك یاخود فرمانێك نیە کە پێویست بکات هەموو موسڵمانان بیکەن بەڵکو تەنها بریتیە لە هەڵبژاردنێك. هەندێك کەس بەهەڵە واتێگەشتوون کە پیاوی موسڵمان پێویستە زیاتر لە ژنێك بهێنێت . بەگشتی ئیسلام (٥) چین لە ڕێگەپێدراوەکان و ڕێگەپێنەدراوەکان لەخۆدەگرێت:-

١. فەرز: واجبەکان، ئەوانەی دەبێت بیکەیت.

٢. موستەحەب: داواکراوە کە بکرێت، ئەوانەی کە باشترە بکرێت.

٣. موباح:- ڕێپێدراو.

٤. مەکروه: داوانــەکراو یــاخود هاننــەدراوە بــەکردنی، ئــەو شــتانەی کەواباشتر نەکرێن.

٥. حەرام: قەدەغەکراو.

فرەژنی دەکەوێتە چینی ناوەڕاست لەوانەی ڕێپێدراوە "موباح". ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەو موسڵمانەی دوو، سێ، چوار ژنی هەیە باشترە لەو موسڵمانەی کەیەك ژنی مارەکردووە.

✍ .. ڕێژەی ماوەی ژیانی ئافرەت زیاترە (درێژترە) لە هی پیاودا:-

عادەتن نێر و مێ تارادەیەك بەڕێژەیەکی نزیك لەیەکتر لە دایك دەبن. بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیە زانستیە بزانین کە منداڵی مێینە خاوەنی بەرگریەکی لەشی زیاتر و بەهێزترە لە بەرگری لەشی منداڵی نێرینە. منداڵە مێینەکان زیاتر لەشیان ئەجەنگێت دژی بەکتریا و نەخۆشی تاوەکو لەشی منداڵە نێرینەکان. هەربۆیەش لە تەمەنی منداڵیدا ڕێژەی مردن لەناو نێردا زیاترە تاوەکو مێ. لەلایەکی تردا کاتی شەڕ و جەنگەکانیش زۆرتر پیاو ئەکوژرێت تاوەکو ئافرەت. ئەمە بێجگە لەوەی کە پیاوان زیاتر تووشی مەرگ ئەبنەوە بەهۆی ڕووداوەکان و نەخۆشیەکان تاکو ئافرەت. هەربۆیەشە کە ماوەی ژیانی ئافرەت زیاترە لەماوەی ژیانی پیاو، هەروەها لەهەموو کاتێکدا ژمارەی بێوەژنەکان زیاترن لە ژمارەی ئەو پیاوانەی ژنەکانیان لەدەست داوە.

✍ .. ڕێژەی پیاو زیاترە لە هیندستان تاکو ڕێژەی ئافرەت بەهۆی لەباربردن و کوشتنی منداڵ لە تەمەنی ساواییدا:-

هیندستان یەکێکە لەوڵاتانەی کەمانەی کە هاوشان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی کەتێیدا ڕێژەی مێ کەمترە لەڕێژەی نێر. هۆکارەکەش بەهۆی ئەو ڕێژە بەرزەی کوشتن و لەناوبردنی ڕەگەزی مێیە لەو وڵاتە لەهەموو ساڵێکدا کاتێک بۆیان دەردەکەوێت کەمنداڵەکەیان کچە. ئەگەر ئەم کارە قێزەونە ڕابوەستێت، هیندستانیش وەکو باقی وڵاتەکانی تر ڕێژەی مێ تێیدا زیاتر دەبێت لە ڕێژەی پیاو.

✍ .. لەجیهاندا، ڕێژەی ئافرەت زیاترە لە ڕێژەی پیاو:-

لە ئەمریکا، ژمارەی ئافرەت بە (٧.٨) ملیۆن ئافرەت ژمارەی پیاوی تێپەڕاندووە. نیوۆرک بەتەنها یەك ملیۆن ئافرەتی زیاترە بەبەراورد بە ژمارەی پیاوی ئەو شارە. لە ژمارەی پیاوەکانی نیوۆرکیش، یەك لەسەر سێ یان نێربازن. بەتێکرایی زیاتر لە (٢٥) میلیۆن نێرباز لەوڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا هەیە، ئەمەش لەڕاستیدا ئەوە ئەگەیەنێت کەئەم پیاوانە ئامادا نین و نایانەوێت ئافرەت مارەبکەن. لەوڵاتێکی تری وەکو بەریتانیای گەورە ژمارەی ئافرەت چوار ملیۆن زیاترە لە ژمارەی پیاوی. ئەڵمانیا پێنج ملیۆن ئافرەتی بە بەراورد بە پیاو

زیاترە. ڕووسیا نۆ ملیۆن ئافرەت زیاتری لەژمارەی پیاو هەیە. تەنها خوا دەزانێت ژمارەی ئافرەت بە بەراورد بە ژمارەی پیاو لەجیهاندا چەندە و چەند زیاترە.

✍ .. بەستنەوەی هەر پیاوێك بە مارەکردنی تەنها یەك ئافرەت گونجاو نیە:-

ئەگەر بێت و هەر پیاوێك یەك ئافرەت مارەبکات، ئەوە زیاتر لە (٣٠) ملیۆن ئافرەت لە ئەمریکا ئەمێننەوە بەبێ هاوسەر (ئەمەش پاش ڕەچاوکردنی ئەو ٢٥ ملیۆن نێر بازەی کە هەیە). لەولاّتەکانی تریش، زیاتر لە (٤) ملیۆن ئافرەت لە بەریتانیای گەورە، (٥) ملیۆن لە ئەڵمانیا و (٩) ملیۆن لە ڕووسیا،بەبێ هاوسەر ئەمێننەوە. ئێستاش وا دابنێ خوشکەکەی من وا ڕێکەوتووە کە یەکێك بێت لە ئافرەتە مارە نەبڕاوەکان لە ئەمریکا، یاخود وا دابنێ خوشکەکەی تۆ یەکێك بێت لەو ژنانە لە ئەمریکا، ئەوکات دوو هەڵبژاردنت لە بەردەم بێت ئەویش یان ئەوەتا خوشکەکەت شوو بکاتە بەپیاوێك کە ژنێکی تری هەیە یاخود ئەوەی کە ببێتە موڵکی گشتی، هیچ هەڵبژاردنێکی تریش نیە. هەموو کەسێکی بەڕێزو بەقەدر هەڵبژاردنی یەکەمی پێ باشتر ئەبێت و هەڵی ئەبژێرێت. ئەوە ڕاستە کەزۆرێك لە ئافرەتان حەز ناکەن

کەپیاوەکانیان ژنێکی تر مارەبکان، بەڵام لە ئیسلامدا کاتێک بارودۆخەکە وا پێویست دەکات و دەخوازێت کەپیاو ژنێکی تر بهێنێت، ئەوکات ئافرەتی موسڵمان بەهۆی باوەڕەکەیەوە ئارام ئەگرێت لەسەر لەدەستدانێکی بچووک لەپێناو ڕێگاگرتن لە لەدەستدانێکی گەورەتر کە ناهێڵێت ئافرەتێکی تری موسڵمان ببێتە موڵکی گشتی.

✍ .. شووکردن بەپیاوێکی خێزاندار باشترە و خوازراوترە یاخود بوونە "موڵکی گشتی":-

لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوا، زۆر ئاساییە کە پیاو لەدەرەوەی بازنەی خێزاندا لەگەڵ ئافرەتی تر ڕابوێرێت، لەم دۆخەشدا ئافرەت ژیانێکی شەرمەزاریانەی پڕ مەترسی ئەبێت. لە کاتێکدا هەر ئەم کۆمەڵگایە ناتوانێت ئەوە قبوڵبکات کە پیاوێك زیاتر لەیەك ژن مارەبکات کە تێیدا ئافرەت ژیانێکی پڕ سەربەرزانە و بەرێزی ئەژێت لەکۆمەڵگا،کەلەدواتردا ژیانێکی سەلامەت و بێ ترسی ئەبێت. بۆیە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان نیە دوو هەڵبژاردن لەبەردەمە ئەویش ئەوەتە یان شوو بکاتە پیاوێکی خێزاندار یاخود ببێتە"موڵکی گشتی". لە ئیسلامیش پێدانی پلەیەکی پڕ ڕێزو سەربەرزانە بە ئافرەت پێ باشترە لەڕێگەی هەڵبژاردنی یەکەم و قەدەغەکردنی

هەڵبژاردنی دووەم. هۆکاری تری زۆر هەیە کەوای کردووە ئیسلام ڕێگە بدات بە فرەژنی بەڵام بەزۆری و بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوەیە کەپارێزگاری بکات لە شکۆ و ڕێزی ئافرەت.

## ٢/ فرە پیاوی ((فرە مێردی)):-

پرسیار:- ئەگەر لە ئیسلامدا ڕێگەدرابێت بە پیاو تازیاتر لەژنێك مارە بکات ئەی کەواتە بۆچی ئەوە لە ئافرەت قەدەغە ئەکات کە شووبکات بە زیاتر لە پیاوێك؟

وەڵام: خەڵکانێکی زۆر بە هەندێك موسڵمانیشەوە، گومان ئەکەن لە لۆژیك و حەقیقەتی ڕێگەدانی پیاو بە مارەکردنی زیاتر لە ژنێك و ڕەتکردنەوەی پێدانی ئەو مافە بەئافرەت تاکو شوو بە زیاتر لە پیاوێك بکات. با زۆر بە یەقین و دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم کە بناغەی کۆمەڵگای ئیسلامی دادپەروەری و یەکسانیە. پەروەردگار پیاو و ئافرەتی بە یەکسانی دروست کردووە، بەڵام بەکۆمەڵە توانا و بەرپرسیاریەتیەکی جیاواز لە یەکتر. پیاو و ئافرەت جیاوازن لە ڕووی جەستە و لایەنی دەروونی، ئەوان هەروەها لەڕووی ڕۆڵ و بەرپرسیاریەتیاندا جیاوازن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەشێوەیەکی گشتی نێر و مێ لە ئیسلامدا

یەکسانن، بەڵام نەك بەشێوەیەکی دەقاودەق یاخود کت و مت (یەکسان بوونێکی تەواوەتی). سوورەتی (النساو)، ئایەتەکانی (٢٢ تا ٢٤) لیستی ئەو ئافرەتانەیە کە پیاوی موسڵمان ناتوانێت مارەیان بکات:-

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ.... ﴿٢٤﴾ ﴾ ( النساء )

ئەم خاڵانەی خوارەوە و چەند هۆکارێکن کەوای کردووە (فرە پیاوی) قەدەغە کرابێت.

١. ئەگەر پیاوێك زیاتر لە ژنێك مارەبکات، دایك و باوکی ئەو منداڵەی لەدایك ئەبێت لەم جۆرە مارەکردنە (فرە ژنی) بە ئاسانی ئەزانرێت و ئەناسرێنەوە. هەم باوك و هەم دایکەکەش زۆر بە ئاشکرایی دیارن. بەڵام لەحاڵەتی شووکردنی ئافرەتێك بە زیاتر لە یەك پیاو، تەنها دایکی منداڵە لە دایك بووەکە ئەزانرێت و ئەناسرێتەوە لەم جۆرە

هاوسەرگیریە (فرە پیاوی)، لەکاتێکدا باوکەی منداڵەکە نەناسراو دەمێنێتەوە. ئاینی ئیسلام بایەخێکی یەکجار زۆر ئەدات بە ناسنامەی دایك و باوکەکە. ئەوەتا تەنانەت دەروونناسەکانیش باس لەو ڕاستیە دەکەن کە ئەو منداڵانەی کە نازانن دایك و باوکیان کێن، بە تایبەتی تریش باوك، ئەوا ئەو منداڵانە تووشی دۆخێکی زۆر سەختی شڵەژان و ناجێگیری دەروونی دەبن، زۆرێك لەومنداڵەنە زۆرجار منداڵیەکی زۆر ناخۆش و تاڵ بەسەردەبەن. هەر لەبەرئەمەشە کە منداڵی ئەوانەی لەشفرۆشن تەمەنی منداڵیان تەندروست و تەواو نیە. ئەو منداڵەی لەم جۆرە هاوسەرگیریە لە دایك ئەبێت، ئەگەر هاتوو داوایکرد لە دایکەکە ناوی باوکەی چیە، ئەوە پێویستە زیاتر لە دوو ناو یان زیاتر بدات. من ئاگادارم لەوەی کە تازەترین پێشکەوتنە زانستیەکان وایکردووە زانینی ناسنامەی دایك و باوکەکە بە ئاسانی بزانرێت لە ڕێگای تاقیکردنەوەی ڕەگەزی، هەربۆیەش ئەم خاڵە بۆ ڕابردوو ئەشیا و گونجاو بوو بەلام بۆ ئێستا ناشێت.

٢. لەڕووی سروشتیدا پیاو زیاتر توانای فرەیی (تعدد)ی هەیە تاوەکو ئافرەت.

٣. لەرووی بایۆلۆجیەوە، زۆر ئاسانە بۆ پیاو کەوەك هاوسەرێك بە ئەرکەکانی هەڵبستێت سەرەڕای بوونی زیاتر لە ژنێك. بەڵام بۆ ئافرەتێك لەهەمان بارودۆخی هاوشێوە و بەبوونی زیاتر لەیەك هاوسەر مەحاڵ و سەخت ئەبێت کە ئەرکەکانی وەکو ژنێك ڕاپەڕێنێت. ئەمەش پاش ڕەچەوکردنی ئەو ڕاستیەی کە ئافرەت بە کۆمەڵێك گۆڕانی دەروونی و جەستەی دەڕوات بەهۆی قۆناغە جیاوازەکانی حەیز (بێ نوێژی) لە ئافرەتدا.

٤. ئەو ئافرەتەی کە زیاتر لە یەك مێردی هەیە لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر هاوبەشی ژیانی هەیە، بەمەش ئەگەری تووشبوونی بە نەخۆشیە سێکسیەکانی هەیە و ئەکرێت ئەم نەخۆشیانە بگوازرێتەوە بۆ هاوسەرەکەی ئەگەرچی هاوسەرەکەشی پێشتر لەگەڵ ژنی تر نەبووبێت. بەڵام ئەم دۆخە بەسەر پیاودا ناسەپێت کە زیاتر لە یەك ژنی هەیە، وە هیچ یەکێك لە خێزانەکانی پێشتر لەگەڵ پیاوێکی تردا نەبووە.

ئەم هۆکارانەی سەرەوە ئەوانەن کە مرۆڤ ئەتوانێت بە ئاسانی هەستیان پێبکات، لە کاتێکدا هۆکارگەلێکی تر هەن کە تەنها پەروەردگار لەڕێگای زانستە ڕەهاکەی ئەزانێت بۆچی فرەپیاوی قەدەغەکردووە.

## ٣/سەرپۆشی ئافرەت:-

پرسیار:بۆچی ئیسلام بێ ڕێزی دەکات بەرامبەر ئافرەت و داوای لێ ئەکات خۆی داپۆشێت؟

وەڵام:دۆخی ئافرەت لە ئیسلامدا زۆربەی جارەکان ئامانجی ڕاگەیاندنە عەلمانیەکان بووە. حیجاب یاخود پۆشاکی ئیسلامی ئافرەت لای هەندێك کەس وەکو نموونەیەك دائەنرێت لە چەوساندنەوەی ئافرەت لەژێر سای ئیسلامدا. پێش ئەوەی باس لەوهۆکارانە بکەین کەبۆچی لەڕووی ئاینیەوە داوای پۆشینی حیجاب کراوە، با بکۆڵینەوە لە پێگەی ئافرەت لە کۆمەڵگاکانی پێش هاتنی ئیسلام.

✍ .. لەڕابردوودا، ئافرەت بێ ڕێزی بەرامبەرکراوە و وەك ئامرازی تێرکردنی ئارەزووەکانی پیاو بینراوە.

ئەم نموونانەی خوارەوە کەلە مێژوودا هەن، ڕاستی پێگەی ئافرەت دەردەخەن لە شارستانیەکانی پێشین کە تا چ ئاستێك پێگەی ئافرەت نزم بووە تائەو ڕادەیەی کەسادەترین شکۆ و مافێکی مرۆڤبوونی لێ زەوتکرابوو.

أ/ شارستانیەتی بابلیەکان: بەگوێرەی یاسای بابلیەکان ئافرەت سووکایەتی پێکرابوو، وە لەتەواوی مافەکانی بێ بەشکراوبوو. ئەوەتا بەکوێرەی یاساکانیان ئەگەر پیاوێك ژنێکی بکوشتایە، ئەوە لەجیاتی ئەوەی پیاوە بکوژەکەیان سزا بدایە دەچوون خێزانی پیاوەبکوژەکەیان دەکوشت.

ب/ شارستانیەتی یۆنانیەکان: شارستانیەتی یۆنانی بە شکۆمەندترین شارستانیەت ناسراوە لەناو شارستانیەتەکانی پێشین. لەژێر دەسەلاتی ئەم سیستەمە شکۆمەندە ئافرەت دابڕێنراوە لەمافەکانی و بەکەم سەیرکراوە. لەبیرو باوەڕی یۆنانی، ئافرەتێکی خەیاڵی بەناوی"پاندۆر" کەپێیان وایە سەرچاوەی بەدبەختی مرۆڤەکانە. یۆنانیەکان ئافرەتیان لەڕەگەزی مرۆڤایەتی دەرکردبوو وە بەنزمتر دایاندەنا لەئاست پیاودا. لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ ئەوەی داوێن پاکی ئافرەت بایەخداربووە و ئافرەت لەپلەیەکی بەرزی ڕێزدا بووە بۆماوەیەك، بەلأم دواتر یۆنانیەکان کەوتنە ژێرباری غرور و لادانی ئەخلاقیەکان. لەدەرئەنجامدا داوێن پیسی بووە کاری بەردەوامی سەرجەمی چینەکانی کۆمەڵگای یۆنانی.

ت/ شارستانیەتی ڕۆمانی: لەو کاتەدا کە شارستانیەتی گەیشتبووە لووتکەی شکۆی، پیاو ئەیتوانی و ئەو مافەی هەبوو کەکۆتایی بەژیانی خێزانەکەی بێنێت. داوێن پیسی و ڕووتی ئافرەت کارێکی باو و ئاسایی بوو لەناو ڕۆمانیەکان.

پ/ شارستانیەتی میسری: میسریەکان وا لە ئافرەتیان دەڕوانی کە سەرچاوەی شەڕ و خراپی یەو نیشانەیەکی شەیتانە.

ج/ عەرەبی پێش ئیسلام: پێش بلاوبوونەوەی ئیسلام لە عەرەبستان، عەرەبەکان بە چاوێکی نزمەوە لە ئافرەتیان ئەڕوانی و زۆرجاریش کە منداڵی مێینە لە دایک ئەبوو، هەر بەزیندویەتی زیندەبەچاڵ دەکرا.

✍ .. ئیسلام ئافرەتی بەرز ڕادەگرێت و یەکسانی پێ دەبەخشێت و دەخوازێت لەئافرت کەپێگەیی کۆمەڵایەتیان بگەڕێننەوە:-

ئیسلام (١٤٠٠) ساڵ بەر لەئێستا پێگەی ئافرەتی بەرزکردەوە و تەواوی مافەکانی پێدا. پێشبینی ئەوەشی لێکردن تا پێگەی خۆیان بەدەست بێننەوە.

* حیجاب بۆ پیاو: زۆرجار ئێمە واگومان ئەبەین کە حیجاب تەنها بۆ ئافرەتە و گفتوگۆی لەسەر ئەکەن. لەکاتێکدا لە قورئانی پیرۆز، پەروەردگار سەرەتا باسی حیجاب "داپۆشینی" پیاوی کردووە و

پاشان هاتووەتە سەر باسکردنی حیجابی ئافرەت. هەروەك لەسوڕەتی (النور) ئەمە ئەبینرێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾

لەو چرکەساتەی کەپیاو سەیری ئافرەتێك دەکات، ئەگەر هەربیرۆکەیەکی خراپ و ناشیرینی بەمێشکیدا هات، ئەوە پێویستە یەکسەر چاوی دابخات و سەیری نەکات.

* حیجاب بۆ ئافرەت: لەئایەتی دواتری هەمان سوڕەت (النور) پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾

✍ .. شەش تایبەتمەندی حیجاب:-

بەگوێرەی قورئان و سونەت شەش تایبەتمەندی پێویستە لە حیجابدا ببینرێت.

١-چەندێتی داپۆشین: یەکەم تایبەتمەندی بریتیە لەوەی پێویستە چەند بەشی لەش داپپۆشێت. کە ئەمەش جیاوازی هەیە لەنێوان پیاو و ژندا. سنووری یاسایی داپۆشین بۆ پیاوان داپۆشینی لەشە لە ناوکەوە تاکو ئەژنۆکان.

بۆ ئافرەتیش، سنووری داواکراوی داپۆشین بریتیە لە تەواوی جەستە جگە لەڕووخسار و دەستەکان تاکو مەچەك. بەڵام ئەگەر خۆیان ویستیان ئەوە ئەتوانن ئەو بەشانەش داپپۆشن. هەندێك لە زاناکانی ئیسلام جەخت دەکەنەوە لەوەی کە ڕووخسار و دەستەکانیش بەشێکن لەسنووری داواکراوی داپۆشین بەحیجاب.

پێنج تایبەتمەندیەکەی تر وەکو یەکن بۆ پیاو و ئافرەت:

٢- پۆشاکەکە پێویستە شۆڕو فراوان بێت و شوێنەکانی لەش دەرنەخات.

٣- پۆشاکەکە پیویستە (ڕوون) نەبێت وەك ئەوانەی کە ئەتوانرێت ئەندامەکانی لەشی لەژێریدا ببینرێت.

٤- پۆشـاکەکە نابێـت زۆر سـەرنجڕاکێش بێـت کـە سـەرنجی ڕەگـەزی بەرامبەر بۆ خۆی ڕابکێشێت.

٥-پۆشاکەکە نابێت هاوشێوەی پۆشاکی ڕەگەزی بەرامبەر بێت.

٦-پۆشـاکەکە نابێـت هاوشـێوەی پۆشـاکی بـێ بـاوەڕان بێـت. نابێـت جلێك بپۆشێت کە تایبەت و هێمای ئایینی بێباوەڕانە.

✍ .. حیجـابی ئاکـار و ڕەوشـتیش لـەخۆدەگرێت لـەنێوان شـتەکانی تر:-

بۆتـــەواو جێبـــەجێکردنی حیجـــاب، هاوشـــان لەگـــەڵ شـــەش تایبەتمەندیەکە، ڕەفتار و ڕەوشت و نیەتی کەسەکەش لەخۆدەگرێت. ئەوکەسـەی کـە بەجێبـەجێکردنی شـەش تایبەتمەندیەکـەی حیجـاب وائـەزانێت کـە حیجاب پۆشـینی بەدروسـتی بـەجێ گەیانـدووە، ئـەوە حیجابی لە گۆشە نیگایەکی تەسکدا بینیووە. حیجاب پۆشینی جل و بەرگ پێویستە هاوشان بێت لەگەڵ داپۆشینی چاوەکان، داپۆشینی دڵ، داپۆشـینی بیرۆکـەکان و داپۆشـینی نیـەت. نـەك ئەوەنـدە بـەڵکو شـێوازی ڕۆیشـتنی کەسـەکە، شـێوازی ڕەفتـار و گوفتاریشـی لەخۆدەگرێت.

✍ .. حیجاب ڕێگری دەکات لە دەستدرێژی و بێزارکردن:-

هۆکاری ئەوەی بۆچی حیجاب بڕیاردراوە بۆ ئافرەت لەسورەتی (الأحزاب) باسکراوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٩﴾﴾

قورئان ئاماژە ئەکات بەوەی کەهۆکاری بڕیاردانی حیجاب بۆ ئافرەت ئەوەیە تاکو ئافرەتی بەڕێز و بەقەدر بناسرێن و بەهۆی ئەمەش پارێزراو بن لە بێزارکردن و دەستدریژی.

✍ .. نموونەی دووخوشکی دووانە: وادابنێ دوو خوشك کە دوانەن و هەر وەکو یەکیش جوانن، بەشەقامێکدا تێپەڕ ئەبن. یەکێکیان حیجابی ئیسلامی پۆشیوە، واتا تەواوی لەش جگە لە ڕووخسار و دەستەکانی تاکو مەچەك. خوشکەکەی تریش پۆشاکێکی ڕۆژئاوای لێ پۆشیوە کە تەنوورەیەکی کورت و تەسکە، لە سوچێکیشدا کەسێکی تاوانبار و نەفس نزم چاوەڕێیە تا ئافرەتێکی دەسبکەوێت و ئارەزووە چەپەڵ و پیسەکانی پێ دابمرکێنێتەوە. بەبڕوای تۆ دەستدرێژ دەکاتە سەر کامیان؟

ئەوەیان کە حیجابی پۆشیوە یاخود ئەوەی تەنوورە کورت و تەسکەکە پۆشیوە؟ عادەتەن وئەتوانین تەنانەت بڵێین هەمووکات دەستدرێژی

دەکاتە سەر ئەو کچەیان کە تەنوورە کورت و تەسکەکەی پۆشیووە، چونکە ئەم جۆرە پۆشاکانە بانگێشتێکی ناڕاستەوخۆی ڕەگەزی بەرامبەر ئەکات بۆ ڕابواردن و دەستدرێژی و سەرەنجیان ڕادەکێشێت. قورئانیش ڕاستگۆیانە ئەوەی ڕاگەیاندووە کە حیجاب ئافرەت ئەپارێزێت لە دەستدرێژی کردن سەر.

✍ .. سزای مردن بۆ دەستدرێژی کاران:-

لە شەریعەتی ئیسلامدا کەسێك تاوانباربێت بە دەستدرێژکردنە سەر ئافرەتێك ئەوە سزاکەی مردنە. هەندێك کەسیش هەن سەریان سووڕماوە لەم سزایە و بە "دڵڕەقانە"ی ئەزانن، تەنانەت هەندێك دەڵێن ئیسلام ئاینێکی دڕندانەی وحشیانەیە. منیش پرسیارێکی سادەم کردووە لەسەدان کەسی غەیرە مسوڵمان. پێیانم وتووە وادابنێ خوا نەخواستە، کەسێك دەستدرێژ بکاتە سەر خێزانەکت، دایکت یاخود خوشکت، تۆش بوویتە حاکم و کەسەکەیان هێنایە بەردەستت. چ سزایەکی دەدەیت؟ هەموو ئەو کەسانە وتیان سزای مردن بەسەر تاوانبارەکە دەسەپێنین، تەنانەت هەندێکیان وتیان ئازارێکی زۆر و قورسی دەدەین تاوەکو دەمرێت، منیش بەوانم ووت باشە ئەگەر کەسێك دەستدرێژی کردە سەر خێزانت یاخود دایکت ئەوە

دەیکوژیت بەڵام ئەگەر هەمان کاری دەستدریژی بەسەر خێزان یاخود کچی کەسێکی تربێت، ئەوە سزای مردنت پێ دڕندانەیە و پێت قەبووڵناکرێت، باشە ئەم دوو پێوەرە بۆچی؟

✍ .. کۆمەڵگای ڕۆژئاوا ڕاست ناکات کاتێك دەڵێت پێگەی ئافرەتی بەرزکردۆتەوە:– ئازادی ئافرەت کە ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ ئەکات هیچ شتێك نیە جگە لە شێوازێکی سوودوەرگرتن لە جەستەی ئافرەت، لەنرخ دابەزاندنی نەفسی و لە ڕێز و شکۆخستنی. ڕۆژئاوا باس لەوە دەکات کەئافرەتی بەرز راگرتووە بەڵام بە پێچەوانەوە پلەی ئافرەتیان نزم کردۆتەوە (بۆ بەدووەم سەیرکردن) یاخود وەکو ئامێر وان لەدەستی شەهوەتبازەکان و بازرگانەکانی داوێن پیسی، یان شاردراونەتەوە لەپشت شاشەی ڕەنگاوڕەنگی هونەر و کەلتوور.

✍ .. ئەمریکا بەرزترین ڕێژەی دەستدرێژکردنی هەیە:–
ئەمریکا یەکێکە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان کەچی بەرزترین ڕێژەی دەستدرێژکردنی تێدایە لەهەموو جیهان. بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی FBI لەساڵی (١٩٩٠) لەهەر ڕۆژێکدا نزیکەی (١٧٥٦) کەیسی دەستدرێژی تۆمارکراون بەتەنها لە ئەمریکا، دواتر ڕاپۆرتێکی تر ئاماژەی بەبوونی (١٩٠٠) حاڵەتی دەستدرێژیکردن کرد لە ئەمریکا. ساڵەکە

باســـنەکرابوو، ڕەنگــە لـــەنێوان (١٩٩٢ یـــان ١٩٩٣) بێــت. ڕەنگــە ئەمریکیەکان بێ شەرمتریش بووبن لەساڵەکانی دواتردا.

ئێستا ئەو سیناریۆیە بهێنە پێش چاوت کە حیجاب پۆشین لە ئەمریکا جێ بەجێ کرا. کاتێك پیاوێك سەیری ئافرەتێکی کردو بیرۆکەی خراپ و ناشرینی بۆ هات یەکسەر چاوەکانی دابخات. لەولاشەوە ئافرەت حیجابی ئیسلامی بپۆشێت واتا هەموو جەستەی جگە لە ڕووخسار و دەستەکان تاکو مەچەك. پاش ئەمەش جگە لە پیاوێك دەستدرێژیکرد سـزای مردنـی بەسـەردا بسـەپێنرێت. پرسـیارێکت لـێ ئەکـەم، لەسیناریۆیەکی وادا، ئایا حاڵەتەکانی دەستدرێژی زیاد دەکەن لەئەمریکا، یاخود وەك خۆی ئەمێنێتەوە، یان ئەوەتا ڕێژەکە دادەبەزێت.

✍ .. بە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام ڕێژەی دەستدرێژیکردن دادەبەزێت:-

هەر لەگەڵ کارکردن بە شەریعەتی ئیسلام دەرئەنجامی ئەرێیی و دڵخۆشکەری لێ بەرهەم دێت. ئەگەر شەر یعەتی ئیسلام لەهەر بەشێکی جیهاندا کاری پێبکرێت جا ئەمریکا بێت یاخود ئەوروپا ئەوا کۆمەڵگا ئەحەسێتەوە. حیجاب سوکایەتی بەئافرەت ناکات بەڵکو بە پێچەوانەوە بەرزی دەکاتەوە و پارێزگاری دەکات لە پاکێتی و کەرامەتی.

## ٤/ ئایا ئیسلام لەڕێگای شمشێرەوە بڵاوبووەتەوە؟

پرسیار: چۆن ئەکرێت بە ئیسلام بوترێت ئاینی ئاشتی لەکاتێکدا لەڕێگای بەکارهێنانی شمشێردا بڵاوبووەتەوە؟

وەڵام: یەکێك لەڕەخنە دیارەکانی هەندێك لەوانەی مسوڵمان نین ئەوەیە ئیسلام گەر لەڕێگای بەکارهێنانی شمشێر و هێز نەبوایە ئەوا ئەو ملیۆنان شوێنکەوتووەی نەدەبوو. ئەم کۆمەڵە خاڵانەی خوارەوە ئەوە ڕوون ئەکەنەوە دوور لەبەکارهێنانی هێز، ئەوا هێزی ئەو ڕاستی و حەقیقەتەی کەلەناواخنی ئیسلامدا هەیە و عەقڵ و لۆژیك هۆکاری ئەو بڵاوبوونە خێرایەی ئیسلام بوون.

✍ .. ئیسلام واتای ئاشتی:- وشەی ئیسلام لەڕەگی "سەلام" هاتوو کە بەمانای ئاشتی دێت. هەروەها بەمانای ملکەچبوون دێت بۆ خودا (الله). کەواتە ئیسلام ئاینی ئاشتیە بەڵام ئەمەش لەڕێگای ملکەچبوونی تەواوی مرۆڤە بۆ ویستی دروستکاری باڵادەست ((الله)).

✍ .. هەندێك جار هێز پێویستە بۆ دەستخستنی ئاشتی:-

تەواوی مرۆڤەکانی دونیا ئارەزوو یاخود پاڵپشتی بوونی ئاشتی و تەبایی ناکەن. زۆرانێك هەن کەئامادەن ئەو ئاشتیە تێکدەن بۆبەرژەوەندی خۆیان. بۆیەش هەندێکجار هێز پێویستە بەکاربخرێت

بۆ پارێزگاریکردنی ئاشتی. هەرلەبەر ئەمەش کەئەبینین پۆلیس هەیە کەهێز بەکاردێنن دژی تاوانکار و تێکدەرانی کۆمەڵگا تاکو ئاشتی ولأت بپارێزن. ئیسلام هانی ئاشتی ئەدات، لەهەمان کاتیشدا داوادەکات لە شوێنکەوتووانی کەبجەنگن دژی ستەم و زۆرداری. جەنگی دژی ستەمیش هەندێکجار پێویستی بە بەکارهێنانی هێزهەیە. لە ئیسلامدا هێز تەنها بەکاردێت بۆ پارێزگاریکردن و هاندانی ئاشتی و دادپەروەری.

✍ .. بۆچوونی مێژوونووس ((دی لاسی ئۆلێری)):-

مێژوونووسی بەناوبانگ (( دی لاسی ئۆلێری)) باشترین وەڵامی داوەتەوە بۆ ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەی کەگوایە بڵاوبوونەوەی ئیسلام دەرئەنجامی بەکارهێنانی شمشێر بووە . ئەو لەلاپەڕە "٨"ی پەرتووکەکەی بەناوی "ئیسلام لەسەر دوو ڕێیانەکە" دەڵێت:

"مێژوو دواجار ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئەفسانە و ناڕاستبوو چیرۆکی بوونی موسڵمانە توندڕەوەکان کە چۆن دونیایان سڕیوەتەوە و شمشێریان بەکارهێناوە بەسەر نەتەوە ژێردەستەکان، بەمەش ئەم چیرۆکە دەبێتە پڕوپووچترین ئەفسانە کە مێژوونووسەکان دووبارەیان کردووەتەوە".

✍ .. موسڵمانەکان (٨٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئیسپانیایان کرد کەچی هەرگیز شمشێریان بەکارنەهێنا تازۆر لەخەڵك بکەن ئاینیان بگۆڕن. کەچی جواتر مەسیحیە خاچپەرستەکان هاتن و موسڵمانیان نەهێشت. موسڵمانێك نەما کەبتوانێت بەئاشکرا بانگ بدات بۆ نوێژکردن.

✍ .. (١٤) ملیۆن عەرەب مەسیحی قیبطین:-

موسڵمانان ( ١٤ سەدە ) فەرمانڕەوایەتی عەرەبستانیان کرد. چەند ساڵێکیش بەریتانیەکان فەرمانڕەوایەتیان کرد پاشان فەرەنسیەکان. کەچی تائێستاش (١٤) ملیۆن عەرەب مەسیحی قیبگین واتا لەبناغەدا مەسیحی بوون. گەر موسڵمانەکان شمشێریان بەکارهێنابێت کەواتا دەبوو ئێستا یەك عەرەب نەمایە کە مەسیحی بێت.

✍ .. نزیکەی ٪٨٠ غیرە موسڵمان لە هیندستان:-

موسڵمانەکان نزیکەی هەزار ساڵ فەرمانڕەوایەتی هیندستانیای کرد. ئەگەر بیانویستایە ئەوە دەیانتوانی هەموو ئەوانەی موسڵمان نین بەزۆر بیکەنە موسڵمان. کەچی ئەمڕۆ نزیکەی (٪٨٠) ی دانیشتوانی هیندستان غیرە موسڵمانن. هەموو ئەو هیندیە غیرە موسڵمانانە شاهێدن کە ئیسلام بڵاونەبۆتەوە لەڕێگای شمشێر.

✍ .. ئەندەنوسیا و مالیزیا:-

ئەندەنوسیا وڵاتێکە کە گەورەترین ڕێژەی موسڵمانی تێدایە لەتەواوی جیهاندا. زۆربەی خەڵکی مالیزیاش موسڵمانن. ڕەنگە یەکێك هەبێت وبپرسێت، ئەرێ کام لەشکری ئیسلامی چووەتە ئەندەنوسیا و مالیزیا؟

✍ .. کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا:-

بەهەمان شێوەی پێشوو ئاینی ئیسلام بڵاوبوونەوەیەکی خێرای هەبوو لە کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا. ڕەنگە ئەمجارەش کەسێك هەبێت پرسیار بکات و بڵێت گەرئیسلام لەڕێگای شمشێرەوە بڵاوبوەتەوە، ئەی باشە کام لەشکری موسڵمانان ڕۆیشتۆتە کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا؟

✍ .. تۆماس کارلیلی:-

مێژوونووسی بەناوبانگ "تۆماس کارلیلی" لە پەڕتووکەکەی "پاڵەوانەکان و پاڵەوان پەرستەکان"، باس لەو هەڵە تێگەیشتنە ئەکات کە دەربارەی بڵابوونەوەی ئاینی ئیسلام هەیە. تۆماس بەم جۆر ئەڵێت:- "شمشێر، بەڵێ بێگومان شمشێر بوو، بەڵام تۆ شمشێر لە کوێ دێنیت؟ هەموو بۆچوونێکی نوێ لەسەرەتادا کەسێك خاوەنێتی، لە

مێشکی کەسێکدا دەبێت، هەر لەوێدا گەشە ئەکات. بەمەش لەهەموو جیهاندا یەك کەس باوەڕی بەو بۆچوونە هەیە، یەك کەس بەرامبەر هەموو کەسەکانی جیهان. وتنی ئەوەی کە ئەو کەسە دەست ئەداتە شمشێر و ڕووبەڕووی ئەو هەموو کەسە ئەبێتەوە سوودێکی وای پێناگەیەنێت. بەگشتی ئەو بۆچوونە هەرخۆی بڵاودەبێتەوە."

✍ .. زۆرلێکردن نیە لەدین:-

لەگەڵ کام شمشێردا ئیسلام بڵاوبوویەوە؟ ئەگەر بێت و موسڵمانان ئەو شمشێرەیان پێ بووایە ئەوە نەیان ئەتوانی بەکاری بێنن بۆ بانگەوازی کردن بۆ ئاینەکەیان چونکە ئەوەتا لە سوڕەتی (البقره) پەروەردگار وا دەفەرمووێت:﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ ( البقرة : ٢٥٦)

✍ .. شمشێری وشیاری و زرنگی:-

ئەوە شمشێری وشیاری و ژیری بوو، ئەو شمشێرەی کە دڵ و ژیری مرۆڤەکان ئەکاتەوە. پەروەردگار لە سوڕەتی (النحل) ئایەتی (١٢٥) بەمجۆرە ئەفەرمووێت:﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾

✍ .. زیـادبوونی شـوێنکەوتوانی لـەنێوان ئاینـەکانی تـری جیهانـدا لەساڵانی ١٩٣٤ تاکو ١٩٨٤:-

لەبابەتێك لە "ڕید ێرس دایگێتست ئەلماناکا" کەساڵی دەرچوونی (١٩٨٦)ە، ئامـارێکی خسـتۆتە ڕوو لەڕێـژەی زیـادبوونی سـەرەکیترین ئاینەکانی جیهان لـەنیو سەدەدا لـەنێوان ساڵانی ١٩٣٤ تـا ١٩٨٤. ئەم بابەتـە لـەگۆڤاری ((زە پلـەین تـروپ ))یـش بڵاوکرابوویـەوە. لەلوتکـەی لیسـتەکە ئـاینی ئیسـلام بـوو کـەزیادبوونی بـەخۆی دیبـوو بەڕێـژەی (٢٣٥٪) پاشـان مەسـیحیەت بـە (٤٦٪). ڕەنگـە کەسـێك پرسـیار بکـات بڵێـت، باشـە ئـەبێت لـەو سـەدەیەدا چ جـەنگێکی لـەخۆگرتبێت کـەوای کردبێت ملیۆنان کەس ئاینیان بگۆڕن بۆ ئیسلام؟

✍ .. ئیسـلام ئاینێکـە کەخێراترین بڵاوبوونـەوەی هەیـە لـە ئـەمریکا و ئەوروپا:-

ئەمڕۆ، ئیسلام تاکە ئاینە کـەخێراترین بڵاوبوونـەوە بەخۆیـەوە دەبینێ لە ئـەمریکا و ئـەوروپا. ئـەبێت چ شمشـێرێك زۆری کردبێـت لـە ڕۆژئـاوا تابەو ژمارە گەورەیە ئیسلام قبوڵبکەن؟

✍ .. دکتۆر جۆسێف ئادەم پیرسۆن:-

دکتۆر جۆسێف ئادەم پیرسۆن ڕاستی وتووە کە دەڵێت ((ئەوانەی کە ئەترسن لەوەی چەکی ئەتۆمی بکەوێتە ژێردەستی عەرەبەکان، بێ ئاگان لەوەی کەبۆمبی ئیسلامی ماوەیەك خراوەتە خوارەوە، ئەوکاتە خراوەتە خوارەوە کە محمد (ﷺ) لەدایك بوو.

## ٥/ موسڵمانان توندڕەو تیرۆریستن:-

پرسیار:- بۆچی زۆربەی موسڵمانان توندڕەو و تیرۆریستن؟

وەڵام: ئەم پرسیارە زۆرجار ڕووبەڕووی موسڵمانان ئەبێتەوە جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود بە ناراستەوخۆ، یان لەکاتی گفتوگۆکردن دەربارەی ئاین یاخود ئەو ڕووداوانەی لە جیهان ڕوودەدات. بە گشتی سەیرکردن موسڵمانان بەردەوامی هەیە لە ڕاگەیاندنەکان کەئەمەش بەهۆی کەمی زانیاریە دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، لەڕاستیدا ئەم کەم زانیارییە و پڕوپاگەندە هەڵەیانە زۆرجار بووەتە هۆی جیاوازی کردن لە مامەڵە و کرداری توندوتیژی بەرامبەر موسڵمانان. ئەو حاڵەتەی ئەمە ئەسەلمێنێت "کەمپینی دژە – موسڵمانە" لە ڕاگەیاندنی ئەمریکی ڕاستەخۆ پاش ڕووداوی

تەقینەوەکەی ئۆکلاهۆما. ڕۆژنامەکان زۆر خێرا بوون لەوەی ڕاستەوخۆ بانگەشەی ئەو چیرۆکەپڕوپووچە بکەن کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە پشت هێرشەکەوەیە. بەڵام دواتردەرکەوت لایەنی بەرپرسیار لە تەقینەوەکە ئەفسەرێکی هێزی سەربازی ئەمریکا بوو.

با هەردوو بانگەشەی " توندڕەوی" و "تیرۆرستی" شی بکەینەوە:-

✍ .. پێناسەی چەمکی "توندڕەوی":-

توندڕەو بەو کەسە دەوترێت کە شوێن بنەمای بنەڕەتی و سەرەکیەکانی ئەو بیر و بۆچوون و ئایدەلۆژیەی باوەڕی پێیەتی دەکەوێت و پشتگیری لێدەکات. بۆ کەسێك کەبیەوێت ببێتە دکتۆرێکی چاك پێویستە بنەما سەرەکی و بنەڕەتیەکانی پزیشکی بزانێت و بەرجەستەیان بکات. بۆ کەسێك تاببێتە بیرکاری زانێکی لێهاتوو ئەوە پێویستە بنەماکانی بیرکاری بزانێت و شوێنیان کەوێت و جێ بەجێ یان بکات. پێویستە ئەوکەسێکی توندڕەو بێت لەبواری بیرکاری. بۆ کەسێك کە بیەوێت زانایەکی لێهاتووبێت پێویستە شارەزابێت و شوێن و بەرجەستەی بنەما سەرەکیەکانی زانست بکات، پێویستە کەسێکی توندڕەوبێت لەبواری زانستدا.

✍ .. سەرجەم توندڕەوەکان وەکویەك نین:-

ناکرێت هەموو توندڕەوەکان وەکویەك سەیربکرێن، ناکرێت سەرجەمی توندڕەوەکان کۆبکەینەوە لەژێر ناونیشانی باش و خراپ. دابەشکردن یاخود بەچین کردنی توندڕەوەکان پشت ئەبەستێتە ئەو بوارەی یاخود ئەو کردارەی کە توندڕەوە تێیدا. دزە توندڕەوەکان دەبنە هۆی کێشە و ناخۆشی بۆ کۆمەڵگا، هەر بۆیەش کەسانی خوازراو نین. ئەمە لەکاتێکدا دکتۆرێکی توندڕەو سوود بە کۆمەڵگا ئەگەیەنێت و بەهۆیەوە دەبێتە خاوەنی ڕێز و قەدر.

✍ .. شانازی ئەکەم کە موسڵمانێکی توندڕەوم:-

موسڵمانێکی توندڕەوم کە پشت بەخوا بنەما سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئیسلام شارەزام و شوێنیان ئەکەوم و هەوڵئەدەم بۆ کارپێکردنیان. موسڵمانی ڕاستەقینە شەرم ناکات لەبوونە توندڕەو. شانازی ئەکەم کە موسڵمانێکی توندڕەوم چونکە ئەزانم بنەما سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئیسلام سوودبەخشن بۆ مرۆڤایەتی و سەرجەمی جیهان. هیچ بنەمایەکی ئیسلام نیە کە زەرەر بگەیەنێت یاخود پێچەوانەی بەرژەوەندی گرۆی مرۆڤ بێت بەگشتی. خەڵکانێکی زۆر هەڵە حاڵیبوونیان هەیە لەو بۆچوونەدان کە کۆمەڵێك لە بنەما و

ڕێنمایەکانی ئیسلام نادادپەروەرانە و نەشیاوە. ئەمەش دەرئەنجامی ئەو زانیاریە کەم و هەڵانەیە کە دەربارەی ئیسلام هەیانە. ئەگەر کەسێك بەعەقڵێکی کراوەو فراوانەوە هەڵسێت بەشیکردنەوەی بنەماکانی ئیسلام ئەوە ئەگاتە ئەو ڕاستیەی کە ئاینی ئیسلام سوود ئەبەخشێت لەسەر هەردوو ئاستی تاکەکەسی و کۆمەڵدا.

✍ .. پێناسەی چەمکی "توندڕەو" بەگوێرەی فەرهەنگ:-

بەگوێرەی فەرهەنگی ((وێبستێر))، توندڕەوی جوڵانەوەیەك بوو لە ناو ئەمریکای پرۆتستانتی کەسەری هەڵدا لەسەرەتای سەدەی بیستەم. ئەوە پەرچەکردارێك بوو دژبە نوێگەری، هەروەها جەختکردنەوە بوو لەبێ کەم و کورتی و بێ خەوشی ئینجیل نەك تەنها لەلایەنی باوەڕو کرداری بەڵکو وەکو تۆمارێکی مێژوویی پێداگیری دەکرد لەوەی کە ئینجیل وتەی خوایە. کەواتە"توندڕەوی" چەمکێکە لەسەرەتادا بەکارهێنراوە بۆ ئەو گروپە مەسیحیەی کە باوەڕیا وا بوو ئینجیل وتەی پەروەردگارە و بێ هیچ هەڵەو خەوشێکە.

بەگوێرەی فەرهەنگی ((ئۆکسفۆرد)) "توندڕەویی" بریتیە لەدەستگرتنێکی توند بە بیروباوەڕی دێرین و سەرەکی هەر ئاینێك، بەتایبەتی ئیسلام.

ئەمڕۆ هەر لەگەڵ بەکارهێنانی وشەی "توندڕەو" لەلای کەسێك، هەموو بیر لە موسڵمانێك ئەکەنەوە کە تیرۆرستە.

✍ .. هەموو موسڵمانێك پێویستە تۆقێنەر بێت:-

هەموو موسڵمانێك پێویستە تۆقێنەر بێت. تۆقێنەر ئەو کەسەیە دەبێتە هۆی ترس و تۆقین. دزێك لەوساتەدا پۆلیس ئەبینێت ئەتۆقێت. پۆلیسەکە تۆقێنەرە بۆ ئەو دزە. بەهەمان شێوە موسوڵمان پێویستە تۆقێنەر بێت بۆ ئەوانەی دژی بنەماکانی کۆمەڵگان وەك دز و پیاوکوژ و دەستدرێژکاران. هەرکاتێك ئەم جۆرە کەسانە موسڵمانانیان بینی پێویستە بتۆقێن و بترسن. بەڵێ ئەوە ڕاستە کە چەمکی تۆقێنەر بەگشتی بەکاردێت بۆ ئەو کەسەی دەبێتە هۆی ترس و تۆقین لەنێو خەڵکان بەگشتی، بەڵام موسڵمانی ڕاستەقینە پێویستە تۆقێنەر بێت بۆ گروپێکی دیاریکراوی خەڵکی بۆ نموونە ئەوانەی دژی بنەماکانی کۆمەڵگان نەك بۆ خەڵکە بێ تاوانەکان. لە ڕاستیدا موسڵمان پێویستە هۆکاری ئارامی و ئاسایش بێت بۆ خەڵکی بێ تاوان.

✍ .. ناونیشانی جیاواز دەدرێتە هەمان کەس بۆ هەمان کردار بۆ نموونە "تیرۆریست" "نیشتیمان پەروەر":-

پێش ئەوەی هیندستان سەربەخۆ بێت لەژێر دەستی بەریتانیا، هەندێك لە جەنگاوەرە ئازادیخوازەکان کەپشتگیری توند و تیژیان نەدەکرد بەتیرۆریست ناونرابوون لەلایەن حکومەتی بەریتانیا کەچی هەمان ئەو کەسانە ستایش دەکران لەلایەن خەڵکی هیندستان بۆ هەمان کارو ناونرابوون بەنیشتیمانپەروەرەکان. کەواتە دوو ناوی جیاواز نرا لە هەمان گروپی خەڵك و بۆ هەمان کردار. یەکێکیان بە تیرۆریست بانگیان ئەکات لە کاتێکدا ئەوەکەی تر پێیان دەڵێت نیشتیمانپەروەر. ئەوانەی لەو بڕوایەدا بوون کە بەریتانیا مافی حکومکردنی هیندستانی هەبوو بەو گروپەی دەوت تیرۆریست. لەکاتێکدا ئەوانەی پێیان وابوو بەریتانیا هیچ مافێکی حکومکردنی هیندستانی نیە ئەوگروپەی بە نیشتیمانپەروەر و جەنگاوەری ئازادیخواز بانگ دەکرد.

هەربۆیەش زۆر گرینگە کە پێش ئەوەی بڕیاربدەین لەسەر کەسێك بەباشی گوێی بۆ ڕابگرین، پێویستە گوێ لە هەردوو لایەنەکە بگیرێت، بارودۆخەکە شرۆڤە بکرێت، هۆکار و مەبەستی کەسەکە ڕەچاوبکرێت

و پشتگوێ نەخرێت، پاش هەموو ئەمانە ئینجا ئەتوانرێت بڕیار بدرێت لەسەر کەسەکە.

✍ .. ئیسلام واتای ئاشتی ئەگەیەنێت:-

چەمکی ئیسلام ئەگەڕێتەوە بۆ ڕەگی "سەلام" کە مانای ئاشتی ئەگەیەنێت. ئیسلام ئاینی ئاشتیە و شوێنکەوتووانی پەروەردە دەکات تاکو پشتگیر و هەوڵی بەدەستهێنانی ئاشتی بدەن لە سەرتاپای جیهاندا.

بۆیە هەموو موسڵمانێك پێویستە توندڕەو بێت لەوەی کە بەتوندی چەمك و بنەما سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئیسلام فێربێت و پێداگیریان لێبکات. هەروەها پێویستە تیرۆریست بێت بەرامبەر بەدژایەتیکارانی بنەما کۆمەڵایەتیەکان تاکو برەو بەئاشتی و دادپەروەری بدات لەکۆمەڵگا.

## ٦/ خواردنی بەرهەمە ئاژەڵیەکان:-

پرسیار:- کوشتنی ئاژەڵ کارێکی دڕندانەیە. بۆچی موسڵمانان بەرهەمە ئاژەڵیەکان بەکاردەهێنن؟

وەڵام: خۆ بەدوورگرتن لە خواردنی ماسی و گۆشت ئێستا بۆتە بزوتنەوەیەك لەسەر تاپای جیهان. هەندێك ئەمە ئەبەستنەوە بە مافەکانی ئاژەڵ. لەڕاستیدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك پێوایە بەکارهێنانی گۆشت و بەرهەمەکانی تری ئاژەڵ جۆرێکە لە پێشێلکردنی مافەکانی ئاژەڵ. ئیسلام بۆ سەرجەمی بونەوەران سۆز و بەزەیی هەیە. لەهەمان کاتدا ئیسلام ڕایگەیاندووە کە پەروەردگار ئەم زەوییە و سەرجەم شتەکانی ناوی بەدیهێناوە بۆسوودی مرۆڤ. ئیتر ئەوە ئەوەستێتە سەر مرۆڤەکان کە سوودمەندبن لەسەرجەم سەرچاوەکانی ئەم جیهانە بەشێوەیەکی ژیرانە وەك نیعمەت و ئامانەتێك لەلای پەروەردگارەوە.

✍ .. موسوڵمان دەتوانێت ڕووەك خۆرێکی تەواو بێت:-

موسڵمان لەهەمان کاتدا دەتوانێت موسڵمانێکی زۆرچاك بێت و هەروەها ڕووەك خۆریش بێت. واجب نەکراوە لەسەر موسڵمان کە بەرهەمە ئاژەڵیەکان بەکاربهێنێت.

✍ .. ئیسلام ڕێگای بە بەکارهێنانی ئەو خواردنانەی ڕووەکی نین دەدات:-

قورئان ڕێگە دەدات بە موسوڵمان تا بەرهەمە ئاژەڵییەکان بەکاربهێنێت،ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەڵگەن لەسەر ئەمە:-

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾﴾ ( المائدة )

﴿وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾﴾ (النحل )

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةًۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾﴾ ( المؤمنون )

✍ .. گۆشت خۆراکێکی سوودمەند و تەندروستە و دەوڵەمەندە بە پڕۆتین:-

ئەو بەرهەمانەی کە ڕووەکی نین سەرچاوەیەکی باشی پڕۆتینن. لە ڕووی زیندە پێکهاتەوە برە پڕۆتینێکی باش لەخۆ دەگرن، بۆنموونە هەر هەشت ترشە ئەمینیە سەرەکیەکان کە لەلەشدا دروست نەبوون و پێویستە هەبن لە خۆراکدا. هەروەها گۆشت ئاسن و ڤیتامین B1 و ((نایسن)).

**✍ .. مرۆڤ دانەکانی بۆ هەردوو جۆر خواردن دەشێت:-**

ئەگەر وردببیتەوە لە ددانی ئاژەڵە ڕووەك خۆرەکان وەکو مانگا و بزن و مەڕ، ئەوە شتێکی هاوشێوە ئەبینیت لەم ئاژەڵانە. هەر هەموویان خاوەنی کۆمەڵە ددانێکی هاوشێوەن لە بەرزی و نزمیدا و لەیەك ئاستدان. ئەگەر بێتوو بەهەمان شێوە وردببیتەوە لە ددانی ئاژەڵە گۆشت خۆرەکانی وەکو شێر و پڵنگ، ئەوە ئەبینیت هەموویان خاوەن ددانی نووك تیژ و وردن کە گونجاوە بۆ خواردنی گۆشت. بەڵام ئەگەر وردبیتەوە لە ددانەکانی مرۆڤ ئەوە ئەبینیت ددانەکانی هەم یەکسان و ڕێکن کە لە بەرزی و نزمیدا هەم تیژ و وردن. هەر بۆیەش ئەم جۆرە ددانە گونجاوە بۆ خۆراکە گۆشتیەکان و ڕووەکیەکان . ڕەنگە یەکێك هەبێت بپرسێت باشە گەر پەروەردگار تەنها خواردنی خۆراکە ڕووەکیەکانی لە مرۆڤ بویستایە، دەی کەواتە بۆچی ددانی تیژ و ووردی پێداون؟ بۆیە شتێکی لۆژیکیە گەر بوترێت کە پەروەردگار ئەوەی لە مرۆڤ چاوەڕێکردووە کە هەردوو جۆر خواردن هەم ڕووەکی و هەم ئاژەڵی بخوات.

✍ .. مرۆڤ دەتوانێت هەردوو جۆری خواردنی ئاژەڵی و ڕووەکی هەرسی بکات:-

سیستەمی هەرسکردن لە ئاژەڵە ڕووەکخۆرەکان بە شێوەیەکە کە تەنها هەرسکردنی خواردنە ڕووەکیەکان ئەتوانێت، ئەمە لەکاتێکدا سیستەمی هەرسکردن لە ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان تەنها توانای هەرسکردنی گۆشتی هەیە. بەڵام سیستەمی هەرسکردن لە مرۆڤدا دەتوانێت خواردنە گۆشتی و ڕووەکیەکان هەرسبکات. گەر پەروەردگار تەنها ئەوەی لە ئێمە بویستایە کە تەنها بەرهەمە ڕووەکیەکان بخۆین، کەواتە بۆچی سیستەمێکی هەرسکردنی پێداوین کە توانای هەرسکردنی بەرهەمە ڕووەکی و ئاژەڵیەکانی هەیە.

✍ .. کتێبی ئاینی هیندۆسەکان ڕێگە ئەدات بە خواردنی خۆراکە ئاژەڵیەکان:-

أ/ ژمارەیەکی زۆری هیندۆسی هەیە کە بەتووندی ڕووەك خۆرن. ئەوان پێیان وایە خواردنی خۆراکە ئاژەڵیەکان دژ بە پەیرەوی ئاینەکەیانە. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە کتێبی ئاینی هیندۆسیەکان ڕێگەی داوە بە خواردنی گۆشت. کتێبە پیرۆزەکانی هیندۆسەکان ئاماژە بە بوونی زانا و پیاو چاکە هیندۆسەکان دەکات کە خۆراکە ئاژەڵی و گۆشتیەکانیان خواردووە.

ب/ لە (مانو سمروتی)، کتێبی یاسای هیندۆسەکان لە بەشی (٥) دێری (٣٠) " ئەو کەسەی کەوا گۆشتی ئەوانە ئەخوات کە بۆ خواردنن ئەوە هیچ کارێکی هەڵەی نەکردووە، ئەگەر چی ئەو هەموو ڕۆژێك ئەو کارە بکات،چونکە خوا هەرخۆی وای کردووە کە کۆمەڵێك هەبێت بخورێن و کۆمەلێکیش بخۆن.
ت/ دێری دواتری هەمان کتێب (مانو سمروتی) بەشی (٥) دێری (٣١) دەڵێت "خواردنی گۆشت دروستە بۆ قوربانی، ئەمە لەڕووی داب و نەریتەوە پێی دەوترێت یاسای خوایەکان.
پ/ هەر لە (مانو سمروتی) بەشی (٥)، دێری (٣٩) و (٤٠)دا دەڵێت " خودا خۆی ئاژەڵی قوربانی دروستکردووە بۆ قوربانی،..... بۆیە کوشتنیان بۆ قوربانیکردن، کوشتن نیە".
ج/ مهابهاراتا ئەنوو شاشان پارڤە، بەشی ٨٨ ئەو گفتووگۆیە ئەگێڕێتەوە کە لەنێوان ((دارمەرج یودشیپیرە)) و (( پیتەماه بیشمە)) دەربارەی ئەوەی چ خواردنێك پێشکەشبکرێت بۆ ((پیتریس)) ((یەکێك لە باپیران)) لەکاتی (( شرژە)) "((ڕێورەسمی مردن)) تاڕازییان بکات.
گفتوگۆیەکە بەم شێوەیە: یود شیپیرە وتی "ئەی خاوەنی هێز و دەسەڵات، پێم بڵێ ئەو شتە دەبێت چی بێت گەر تەرخان بکرێت بۆ

پـیتریس ((بـاپیره مردووەکـان))، ئـەو شـتە لەکارناکـەوێت! ((هـاڤی))
جـارێکی تـریش چ شـتێك گـەر پێشکەشـبکرێت بـۆ هـەموو کاتێـك
ئەمێنێتەوە؟ ئەو شتە دەبێت چی بێت گەر پێشکەش بکرێت دەبێتە
نەمری و سەرمەدی؟

بهیشمه ووتی " گوێم بۆ بگر ئەی یودشیپیره،((لاپەره ٢٠))

.. هیندوسی کەوتبووە ژێر کاریگەری ئاینەکانی تر:-

هەرچـەندە ئـاینی هیندۆسـی ڕێگـەی داوە بـە شـوێنکەوتوانی بـە
خـواردنی خواردنـە ئاژەڵیـەکان، کەچـی زۆرێـك لـە هیندۆسـەکان
سیستەمێکی ڕووەکخۆرانە بەکاردێنن چونکە کەوتوونـە ژێرکاریگـەری
ئاینەکانی تری وەکو "جەینیزم".

.. ڕووەکەکانیش خاوەنی ژیانن:-

چـەند ئـاینێکی دیـاریکراو سیسـتەمێکی ڕووەکخۆریانـە بـەکاردێنن
وەکـو ڕیـژێم کـردن چـونکە ئـەوان دژی کوشـتنی شـتە زینـدووەکانن.
ئەگەر کەسێك هـەبێت بتوانێـت بـەبێ کوشتنی شتە زیندووەکان بژیت
ئەوە من ئەبمە یەکەم کەس کەژیانێکی وابژیم. لەکۆنـدا لـەو بڕوایـەدا
بـوون کـە ڕووەکـەکان بـێ ژیـانن بـەڵام ئێسـتا ڕاسـتیەکی جیهانیـە
کەڕووەکەکانیش ژیانیان هەیە. هەر بۆیـەش بیرۆکـەی نەکوشتنی شتە
زیندووەکان بە بوونە کەسێکی ڕووەکخۆر جێ بەجێناکرێت.

✍ .. ڕووەکەکانیش هەست بە ئازار ئەکەن:-

ئەوان دەڵێن باشە خۆ ڕووەکەکان هەست بە ئازار ناکەن. بۆیە کوشتنی ڕووەك تاوانێکی ئاسانترە یاخوود سووکترە بە بەراوردی کوشتنی ئاژەڵ. ئەمڕۆ زانست پێمان دەڵێت ڕووەکەکانیش هەست بەئازار دەکەن بەڵام هاوار و گریانی ڕووەکەکان لەلایەن مرۆڤەوە ناتوانرێت ببیسترێت. ئەمەش بەهۆی نەتوانینی بیستنی مرۆڤە کە ناتوانێت ئەو دەنگانەی لەناو ڕێژەی بیستندا نین ببیستێت کە ڕێژەکە لە (٢٠) هێرتز تاکو (٢٠,٠٠٠) هێرتزە. هەر دەنگێك لە سەروو یاخود خوارووی ئەم ڕێژەیە ناتوانرێت ببیسترێت لەلایەن مرۆڤ. توانای بیستنی سەگ زیاتر لە (٤٠,٠٠٠) هێرتزە. ئەم فیتەیە تەنها لەلایەن سەگەوە دەبیسترێت و مرۆڤ ناتوانێت بیبیستێت. سەگەکە ئەو کەسەی فیتەکەی لێداوە ئەدۆزێتەوە و بەرەولای دەچێت. لێکۆڵینەوەیەك کرا لەلایەن جوتیارێکی ئەمریکا، کە ئەو جوتیارە ئامێرێکی داهێنا کەوای ئەکرد هاواری ڕووەکەکان ببیسترێت لەلایەن مرۆڤەوە. دەیتوانی ڕاستەوخۆ بزانێت چ کاتێك ڕووەکەکە هاواری ناو دەکات. نوێترین لێکۆڵینەوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە ڕووەکەکان دەتوانن تەنانەت هەست بکەن بە بەختەوەری و دڵتووندی یاخود تەنانەت گریانیش ئەتوانن.

✍ .. کوشتنی شتە زیندووەکان کە خاوەنی دوو لەهەستەکانن تاوانێکی سووکترنیە:-

کاتێك کە ڕووەکخۆرێك لەو بڕوایەدایە ڕووەکەکان تەنها دوو یاخود سێ لەهەستەکانیان هەیە بەڵام ئاژەڵ پێنج لە هەستەکانی هەیە. بۆیەش کوشتنی ڕووەکەکان تاوانێکی سووکترە لە کوشتنی ئاژەڵ. وادابنێ براکەت هەر بە کەڕو لاڵی لە دایك بووە و بە بەراورد بە مرۆڤی ئاسای دوو دانە لە هەستەکانی کەمترە و گەورە ئەبێت و کەسێك دەیکوژێت ئایە تۆ دەچیت بە حاکم بڵێیت سزایەکی سووك بەسەر بکوژەکەدا بسەپێنن چونکە براکەم دوو دانە هەستی کەمتر بوو؟ بگرە لەڕاستیدا تۆ دەچیت دەڵێیت ئەو کەسێکی بێ گوناهی کوشتووە هەر بۆیەش دەبێت سزایەکی گەورەتری بدرێت.

لەڕاستیدا قورئان بەم جۆرە ئەدوێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِى ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا﴾ (البقرة :١٦٨)

✍ .. بەرز بوونەوەی ئاژەڵەماڵیەکان:-

ئەگەر هەموو مرۆڤەکان ڕووەکخۆر بن ئەو کات دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی ڕێژەی ئاژەڵە ماڵیەکان بەتایبەت کاتێك زاوزێکردن و زۆربوون تێیاندا خێرایە. پەروەردگار بەهۆی زانستی ڕەهای خۆی

دەزانێت چۆن هاوسەنگی و ئەندازەگیری دروستکراوەکانی بکات. ئیتر گومانێك نامێنێت کە بۆچی ڕێگەی پێداوین بەخواردنی گۆشتی ئاژەڵە ماڵیەکان.

✍ .. بەهۆی ئەوەی هەموو ڕووەکخۆرنین بۆیە نرخی گۆشت گونجاوە:-

ئاساییە بەلامەوە گەر هەندێك کەس ڕووەکخۆر بێت. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەوانەی کە ڕووەکخۆرنین بە دڕندە و بێبەزەیی ناوببات. لەڕاستیدا گەر هەموو خەڵکی هیندستان ببنە گۆشتخۆر ئەوکاتە گۆشتخۆرەکانی ئێستا زەرەرمەندن چونکە نرخی گۆشت بەرز دەبێتەوە.

## ٧/ شێوازی سەربڕینی ئاژەڵ لە ئیسلامدا شێوازێکی دڕندانەیە:-

پرسیار:- بۆچی موسڵمانان دڕندانە سەری ئاژەڵ ئەبڕن بە ئازاردانی و پاشان بەهێواشی و پڕ ئازار دەیکوژن؟

وەڵام: شێوە ڕێگای سەر بڕینی ئاژەڵ لەئیسلامدا کە ناسراوە بە ((ذبح)) بووەتە ئامانج و خاڵی ڕەخنەگرتن لەلایەن زۆرێك لە خەڵکەوە. بەڵام بەڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەوکات دەرئەکەوێت کە

((ذبح)) نەك هەر شێوازێکی مرۆڤانەیە بەڵکو لەڕووی زانستیەوە باشترین ڕێگایە.

✍ .. شێوازی سەربڕین لە ئیسلامدا:-

((زکاة)) وشەیەکە لە ڕەگی ((زکاة)) "((پاکردنەوە)).هەروەها وشەی ((تزکیە)) بەمانای ((پاك بوونەوە)) دێت. ڕێگای سەربڕینی ئاژەڵ لە ئیسلام پێویستە ئەم مەرجانە لە خۆ بگرێت:-

ا/ ئاژەڵەکە پێویستە سەرببڕدرێت بە ئامێرێکی تیژ ((چەقۆ)).

هەروەها پێویستە بەخێرایی سەربڕینەکە ئەنجام بدرێت تاکو ئازاری سەربڕینەکە کەمتر ببێتەوە.

ب/ بڕینی بۆری هەوا و قوڕگ و دەمارەکانی مل:-

((ذبح)) وشەیەکی عەرەبیە بەمانای ((سەربڕین)) دێت. سەربڕینەکە بریتیە لە بڕینی قوڕگ و بۆری هەوا و دەمارەکانی خوێن لە ملدا کە ئەبێتە هۆی مردنی ئاژەڵەکە بەبێ بڕینی دڕکە پەتك.

ح/ پێویستە خوێن بەتاڵ بکرێتەوە:-

پێویستە خوێنەکە بەتەواوی خاڵی بکرێتەوە پێش ئەوەی سەرەکەی ببڕدرێت. ئامانج لەمەدا ئەوەیە خوێنەکە بکرێتە دەرەوە کە ئەکرێت وەکو ناوەندێکی بەسوود ڕۆڵ بگێرێت بۆ بەشەکانی تری جەستە.

دڕکەپەتك پێویستە نەبڕدرێت چونکە ڕەنگە ڕیشاڵە دەمارییەکانی بەرەو دڵ زەرەریان پێ بگات کە ئەمەش ئەبێتە هۆی ڕاوەستانی لەناکاوی دڵ و خاوبوونەوە یاخود ڕاوەستانی ڕۆیشتنی خوێن بەناو بۆریەکانی خوێندا.

✍ .. خوێن ناوەندێکی باشە بۆ بەکتریا و ڤایرۆس:-

خوێن ناوەندێکی گونجاوە بۆ بەکتریا و ڤایرۆس و ژەهر. هەربۆیەش شێوازی سەربڕین لە ئیسلامدا شێوازێکی زۆر دروست و خاوێنە بەوەی زۆرێك لەوخوێنەی کە هەڵگری ڤایرۆس و بەکتریا و ژەهرە کە هۆکاری زۆر نەخۆشین فرێدەدرێتە دەرەوە.

✍ .. گۆشت بۆ ماوەیەکی درێژ وەکو خۆی دەمێنێتەوە و تێك ناچێت.

ئەو گۆشتەی بەشێوازی سەربڕینی ئیسلامی ئامادەکرابێت ئەوە بۆ ماوەیەکی درێژ وەکو خۆی دەمێنێتەوەو تێك ناچێت ئەمەش بەهۆی کەمی یاخود نەبوونی خوێن لەگۆشتەکە بەبەراورد بە شێوازەکانی تری سەربڕین.

✍ .. ئاژەڵ هەست بە ئازەر ناکات:-

بڕینی لەسەرخۆی دەمارەکانی مل دەبێتە هۆی پچڕانی تەوژمی ڕۆیشتنی خوێن بۆ دەمارەکانی مێشك کە بەرپرسیارە بۆ ئازار، هەر

بۆیــەش ئاژەڵەکــە هەســت بــەئازار ناکــات. لــەکاتی مردنیــدا ئــەبینیت ئاژەڵەکــە ئــەجوڵێت و ئەلــەرزێت و پەلەقاژەیــەتی کــە ئەمــە بــەهۆی ئــازەرەوە نیــە بــەڵکو یەکــەم بــە هــۆی پشــوو دان و حەوانــەوەی ماسـولکەکانە لـە خـوێن و دووەمـیش بەهۆی تـەوژمی کردنـە دەرەوەی خوێنە لەلەشدا.

## ٨/ خواردنــە ئاژەڵیــەکان والــە موســڵمان ئــەکات تونــدڕەو و ئاژەوەچی ئەبێت:-

پرسیار:- زانست پێمان ئەلێت هەرشتێك مرۆڤ بیخوات کاریگـەری دەبێت لەسەر هەڵسوکەوتی. کەواتە بۆچی ئیسلام ڕێیداوە بە موسڵمان بەخواردنی خۆراکە ئاژەڵیەکان لە کاتێکدا ئەو خۆراکانە ڕەنگە مرۆڤ بکاتە کەسێکی بێ بەزەیی و توند وتیژ؟

وەڵام:-

✍ .. تەنها خواردنی ئاژەڵە ڕووەکخۆرەکان ڕێگەپێدراوە:-

هاوڕام لەگەڵ ئەوەی کە هەرشتێك مرۆڤ بیخوات کاریگـەری دەبێت لەســەر هەڵســوکەوتی. هــەر لەبەرئەمــەش ئیســلام خــواردنی ئاژەڵــە گۆشــتخۆرەکانی قەدەغــە کــردوە وەکــو شــێرو پڵــنگ کــە ئــەم جــۆرە

گیاندارانە دڕندە و بێ بەزین. ڕەنگە خواردنی گۆشتی ئەم ئاژەڵانە وا لەمرۆڤەکە بکات کە ببێتە کەسێکی دڕندە و بێ بەزەیین. ئاینی ئیسلام تەنها خواردنی ئاژەڵە ڕووەکخۆرەکانی ڕێپێداوە وەکو مەڕ و بزن و مانگا...هتد. کە ئەم ئاژەڵانەش ئارام و بێ زیانن. موسڵمانان ئاژەڵی ئارام و بێ زیان ئەخۆن چونکە موسڵمانان کەسانێکن ئاشتی و ئاسایشیان خۆشدەوێت و خەڵکانێکی بێ کێشە و زیانن.

✍ .. قورئان دەڵێت پێغەمبەر ئەوە قەدەغە دەکات کە خراپ بێت:-

قورئان دەڵێت بەمشێوازە ئەدوێت:﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾ (الأعراف :١٥٧)

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ (الحشر :٧)

بۆ موسڵمان فەرموودە و وتەی پێغەمبەر (د.خ) بەسە تا باوەڕی پێ بێنێت کە پەروەردگار نایەوێت مرۆڤ هەندێك جۆری گۆشت بخوات لەکاتێکدا هەندێك جۆری تری ڕێپێداوە.

✍ .. فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی قەدەغەکردنی خواردنی ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان:-

بە گوێرەی کۆمەڵێك فەرموودەی صحیحی پێغەمبەر (ﷺ) لە صحیحی بوخاری و صحیحی موسلیم هاوشان لەگەڵ ئەو

فەرموودەیەی کە ئیبن عەباس گێڕاویەتیەوە لە صحیحی موسلیم، بەشی ڕاوکردن و سەربڕین فەرموودەی ژمارە ٤٧٥٢ و پەرتووکی (سنن ابن ماجە) بەشی ١٣ فەرموودەی ٣٢ ٣٢ تاکو ٣٤ ٣٢ پێغەمبەر (ﷺ) خواردنی ئەم ئاژەڵانەی قەدەغە کردووە:-

١- ئاژەڵی کێوی خاوەن ددانی کەڵبەیی. ئەوانەی کە گۆشتی ئاژەڵی گۆشتخۆرەکانی تر دەخۆن. ئەم ئاژەڵانە ئەوانەن لە گروپی پشیلەکان وەکو شێر، پڵینگ، پشیلە، سەگ، گورگ، کەمتیار...هتد.

٢- ژمارەیەک لە ئاژەڵە تووکدارەکان وەک مشک، جرج، کەروێشک...هتد.

٣- هەندێک لە ئاژەڵە خشۆکەکان وەک مار.

٤- ئەو باڵندانەی باڵندەکانی تر ڕاودەکەن وەکو باز و هەڵۆ و کوندەپەپوو و قەلەڕەش .

هیچ بەڵگەیەکی زانستی نیە کە بیسەلمێنێت خواردنی خۆراکە ئاژەڵیەکان مرۆڤ تووشی توندڕەویی و بێ بەزەیی دەکەن.

## ٩/ موسڵمانان کەعبە ئەپەرستن:-

پرسـیار: ئەگەر موسـڵمانان دژی بـت پەرسـتین، دەی کەواتـە بۆچـی موسڵمانان سوجدە بۆ کەعبە دەبەن و لەنوێژەکاندا دەیپەرستن؟

وەڵام: کەعبـە قیبلەیـە، یـاخود ئـەو ڕووگەیـە کـە موسـڵمانان لـەکاتی نوێژەکانـدا ڕووی تێدەکـەن بـەڵام ئـەوەش پێویسـتە بزانرێـت کاتێـک موسـڵمانان ڕوودەکەنـە قیبلـە لـەکاتی نوێـژ مانـای وانیـە کـە کەعبـە ئەپەرستن. موسڵمانان جگە لە "الله" سـووجدە بـۆ هـیچ کەسێک نـابن و پەرستشـی ناکـەن. ئەمـەش لـە ئایـەتێکی سـوڕەتی (البقـرة) بـەجوانی ڕووندەبێتەوە، کاتێک پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ ﴾ (البقرة : ١٤٤)

.. ئیسلام بانگەژەی یەکگرتن و یەکریزی ئەکات:-

وادابنێ کاتێـک موسـڵمانان نوێژدەکـەن، ڕەنگـە موسـوڵمانێک بیـەوێت ڕووبکاتـە بـاکوور و یـەکێکی تـر ڕەنگـە بیـەوێت ڕوووبکاتـە باشـوور، بەمـەش گـرژی و ناخۆشـی بڵاودەبێتـەوە لـەناو موسـوڵمانان بڵاودەبێتەوە. جا بۆئەوەی پاراستنی یەکریزی و یەکبوونی موسڵمانان

لە بەندایەتی کردنیان بۆ پەروەردگار بێتەدی، موسوڵمانان داوایان لێکراوە لەهەر شوێنێك بوون ڕووبکەنە یەك ڕووگە کە ئەویش کەعبەیە. هەربۆیەش ئەو موسوڵمانانەی کە لای ڕۆژئاوای کەعبە ئەژین ڕوودەکەنە ڕۆژهەڵات، ئەوانەشی کە لای ڕۆژهەڵاتی کەعبە ئەژین بە پێچەوانەوە ڕوودەکەنە ڕۆژئاوا.

✍ .. کەعبە دەکەوێتە چەقی نەخشەی زەوی:-

موسوڵمانان یەکەم کەس بوون کە توانیان نەخشەی جیهان بکێشن. نەخشەکەیان بەوشێوەیە کێشا کە باشوور لە سەرەوە و باکوور لە خوارەوە بوو، کەعبەش دەکەوتە ناوەڕاستی نەخشەکە. دواتر نەخشەکێشە ڕۆژئاوایەکان هاتن و نەخشەیەکی تریان داڕێژا بەو شێوەیەی کە باکوور لەسەرەوە و باشوور لە خوارەوە بێت، بەڵام لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریەشدا کەعبە هەر لەناوەڕاستی نەخشەکە مایەوە.

✍ .. سوڕانەوە بەدەوری کەعبە ئاماژە بە بوونی خوایەکی تاك و تەنها:-

کاتێك موسڵمانان ئەچنە "مسجد الحرام" لە مەککە، ئەوە موسڵمانان هەڵدەستن بە سوڕانەوە بەدەوری کەعبە. ئەم کارەش وەك هێمایەك یاخود ئاماژەیەك دادەنرێت بۆ بوونی خوایەکی تاك و تەنها،چونکە

هەروەکو چۆن هەموو بازنەیەك یەك چەقی هەیە، بەهەمان شێوە تەنها یەك خوا هەیە کە شایستەی پەرستش بێت ئەویش زاتی "الله"یە.

✍ .. فەرموودەکەی ئیمامی عومەر (رضي الله عنه):-

دەربارەی بەردە ڕەشەکە "الحجر الاسود"، لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووداوێك هەبوو کە ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) بەشێك بوو تێیدا، بەگوێرەی "صحیح بوخاری"، بەرگی دووەم، بابەتی حەج، بەشی (٥٦) و فەرموودەی ژمارە (٦٧٥) ڕووداوەکە بەمشێوەیە: کاتێك ئیمامی عومەر پێغەمبەری (ﷺ) بینی بەردە ڕەشەکەی ماچکرد، ئەویش چووە پێشەوە و بە بەردە ڕەشەکەی وت " من ئەزانم کە تۆ تەنها بەردێکیت کە نەئەتوانیت سوودم پێبگەیەنیت وە نەئەتوانی زیانم پێبگەیەنیت، ئەگەر بهاتبا و پێغەمبەرم (ﷺ) نەبینیایە کە دەستی پیاهێنایت و ماچی کردیت، ئەوە هەرگیز دەستم نەدەهێنا پێتدا و ماچم نەدەکردی.

✍ .. خەڵك لەسەر کەعبە ڕاوەستاون و بانگیان داوە:-

لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کەسانێك هەبوونە لەسەر کەعبە ڕاوەستاون و بانگیان داوە. ڕەنگە کەسێك هەبێت بپرسێت لەوانەی کە موسڵمانان بە پەرستنی کەعبە تۆمەتبار ئەکەن، باشە چ بت پەرستێك هەیە لەسەر ئەو بتەی کەدەیپەرستێت ڕابوەستێت؟

## ١٠/ غەیرە موسوڵمان ڕێگەیان پێنەدراوە لەچوونە مەککە:-

پرسیار: بۆچی غەیرە موسڵمان ڕێگەیان پێنەدراوە لەچوونە مەککە و مەدینە؟

وەڵام: بەڵێ، ئەوە ڕاستە کە لەڕووی یاساوە غەیرە موسڵمان ڕێگەی پێنەدراوە بچێتە هەردوو شاری مەککە و مەدینە. ئەم چەند خاڵەی خوارەوە ڕەنگە هۆکاری پشت ئەم ڕێگەپێنەدانە ڕوونبکاتەوە.

✍ .. هەموو هەولاتیەك ڕێگەی پێنەدراوە بچێتە ناوچە سەربازیەکان:-

من کە هاولاتیەکی هیندستانم کەچی هەندێك شوێنی قەدەغەکراو هەیە کە ڕێگەم پێنەدراوە بچمە ناوی بۆ نموونە ناوچە سەربازییەکان. لەهەموو ولاتێك چەند ناوچەیەك هەیە کە خەڵکە ئاساییەکان ناتوانن بچنە ناوی. لە ناوچە سەربازییەکان تەنها ئەو کەسانە ڕێگەیان پێدراوە کە کە ناوی لەسەربازیدا تۆمارکرابێت یاخود ئەوانەی پەیوەندیان بە بەشی بەرگری دەوڵەتەکە هەبێت. ئاینی ئیسلامیش وەك ئاینێکی جیهانی کە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی هاتووە، ناوچە پارێزرا و تایبەتیەکانی بریتین لە مەککە و مەدینە. لەم دوو ناوچەیەدا

تەنها ئەوانەی کە بڕوایان بە ئیسلام هەیە یان ئەوانەی بەشێکن لە بەشی بەرگری لە ئیسلام و موسڵمانان ڕێگەیان پێدراوە.

هەروەکو چۆن شتێکی نەشیاو و نالۆژیکیە کە خەڵکە ئاساییەکە بێت و ناڕازەیی دەرببڕێت لەوەی کە ڕێگەی پێنادرێت بچێتە ناوچە سەربازییەکان، بەهەمان شێوە گونجاو نیە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە ئیسلام نیە ڕەخنەبگرن لە قەدەغەکردنیان لە چوونە ناو مەککە و مەدینە.

✍ .. فیزەی چوونە مەککە و مەدینە:-

ا/ هەرکەسێك کە بیەوێت بچێتە ولاَتێکی تر پێویستی بە وەرگرتنی فیزەیە تا بتوانێت بچێتە ئەو ولاَتە. هەر ولاَتێکیش بۆ پێدانی فیزە کۆمەڵێك یاسا و پێوەر و داواکاری تایبەتی خۆیان هەیە، تاکو ئەو داواکاریانە جێبەجێ نەکرێن فیزەکەت پێنادەن.

ب/ یەکێك لەو ولاَتانەی کە زۆر بەربەستیان هەیە لە پێدانی فیزە ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە لەجیهانی سێیەمەوە دێن، کە کۆمەڵێك داواکاری و مەرجی قەرس و سەختیان هەیە کە پێویستە جێ بەجێبکرێن تاکو فیزەکەت پێبدرێت.

ت/ کاتێک سەردانی سینگاپوورم کرد، لە فۆڕمی کۆچکردنیاندا نوسرابوو "سزای مردن بۆ فرۆشیار و کڕیارانی مادده هۆشبەرەکان". بۆیە گەر بمویستایە بچمە ناو ئەو وڵاتە ئەوە پێویست بوو ڕازیبم بەو یاسانە، نەم ئەتوانی بڵێم سزای مردن دڕندانەیە. هەربۆیەش پێویست بووڕازی بم بە سەرجەم داواکاری و مەرجەکانی ئەو وڵاتە تا مافی چوونەناو وڵاتەکە وەربگرم.

پ/ سەبارەت بە فیزەی چوونە ناو شاری مەککە و مەدینە بۆ هەرکەسێک، سەرەکیترین مەرج کە داواکراوە ئەوەیە کە کەسەکە بڵێت "لا اله الا الله و محمد رسول الله".

## ١١/ حەرامکردنی بەراز:-

**پرسیار: بۆچی خواردن بەراز لە ئیسلامدا حەرامکراوە؟**

**وەڵام: هۆکاری حەرامکردنی بەرز لە ئیسلام ڕوون و ئاشکرایە، ئەم چەند خاڵەی خوارەوەش چەند لایەنێکی ئەو حەرامکردنە ڕووندەکاتەوە:-**

**✍ .. لەقورئاندا بەراز حەرامکراوە:-**

**قورئان لە چوار شوێندا حەرامکردنی خواردنی بەرازی باسکردووە، کە ئەوانیش:-**

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ﴾ (البقرة :١٧٣)

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ ( المائدة : ٣)

﴿قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ ( الأنعام : ١٤٥)

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ (النحل :١١٥)

**ئەم ئایەتانەی قورئانیش بەسە بۆ موسڵمانێك تاكو بزانێت ئیسلام بۆچی خواردنی بەرازی حەرامكردووە.**

✍ .. حەرامکردنی بەراز لە ئینجیلدا:-

مەسیحیەکان کە زۆر پەیوەستن بە ئینجیلەوە، کەچی هەر ئینجیل خواردنی بەرازی حەرامکردووە، کە ئەویش لە پەڕتووکی "لیفیتوکوس"

- " هەروەها بەرازیش، کەئەوانیش دوو سمیان هەیە، وە هەرچەندە کاوێژیش دەکەن ، ئەوان پیسن بۆ ئێوە."

"نابێت لە گۆشتەکەیان بخۆیت، هەروەرها نابێت دەست بدەیت لەلاشەیان، چونکە زۆر پیسن بۆت."

(لیفیتوکوس ١١: ٧-٨)

بەهەمان شێوە حەرام کردنی خواردنی بەراز لە ئینجیلدا و لە پەڕتووکی "دیوتێرنۆمی":-

- "هەروەها بەراز،هەرچەندە دووسمیان هەیە ، وە کاوێژیش دەکەن. ئەوان پیسن بۆ ئێوە. ئێوە نابێت گۆشتەکەی بخۆن، تەنانەت دەست لە لاشەکەشیان مەدەن. چونکەزۆر قیزەون و پیسن."

✍ .. بەکارهێنانی بەراز بەهەرجۆرێك دەبێتە هۆی زۆرێك نەخۆشی:-

ملحد و بێباوەڕان کاتێك ڕازی دەبن و باوەڕ دەکەن کاتێك بەڵگەیەکی زانستی و بابەتیانە و واقیعانەیان بخرێتە بەردەست. خواردنی بەراز

بەلایەنی کەمەوە دەبێتە هۆی (٧٠ ) جۆری جیاوازی نەخۆشی ،وەك دروستبوونی چەندین کرمی مشەخۆر کە زۆر مەترسیدارن و توانایان هەیە لە ڕێگەی خوێنەوە بگەنە هەموو ئەندامەکانی لەش،و، گەر بگەنە مێشك تووشی بیر چونەوەوسەرئێشەی دەکەن،و،گەر بگەنە دڵ تووشی جەڵدەی دڵی دەکەن،و، گەربگەنە چاو تووشی کوێری دەکەن،و وە هەندێك جاریش دەبنە هۆی مردن .
✍ .. بەراز ماددەی چەوری تێدایە:-
نەك هەرئەوەی بەراز بڕێکی زۆر کەم ماددەی دروستکردنی ماسولکەی تێدایە لە لەشدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە ماددەی چەوری تێدایە. دواتر ئەم چەوریە بەناو دەمارەکاندا بلاْدەبێتەوە و دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و سەکتەی دڵ. هەربۆیەش هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە کە زیاتر لە (٥٠٪)ی ئەمریکیەکان تووشی بەرزی پەستانی خوێن دەبن.
✍ .. بەراز یەکێکە لە قێزەونترین و پیسترین ئاژەڵەکانی سەرزەوی:-
بەراز یەکێکە لە پیسترین ئاژەڵەکانی سەر زەوی. ئەم ئاژەڵە بۆ گەشەکردن و ژیانی پشت دەبەستێت بە خواردنی پیسایی و پاشماوە. بەمەش بەلای منەوە باشترین پیسی پاکەرەوەیە کە پەروەردگار

دروستی کردبێت. لەو گوندانەی کە ئاودەستی ئەم سەردەمیانەیان نیە و گوندنشینەکان لێرە و لەوێ پیسایی دەکەن، زۆربەی جارەکان بەرازەکان هەڵدەستن بە پاکردنەوەی ناوچەکە. ڕەنگە کەسێك بێت و بڵێت لە هەندێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەکو ئوستڕالیا بەرازەکان لە شوێن و بارودۆخێکی پاك و خاوێندا بەخێودەکرێن. ئەوکاتیش هەرچەند هەوڵبدەیت تا لە لەوەڕگایەکی پاك و خاوێن کۆیان بکەیتەوە، ئەوە هەر هەمان دەرئەنجامت دەست دەکەوێت بەوەی کە ئەوان ئاژەڵی پیسن. بۆیەش لەو دۆخەدا ئەوان هەڵدەستن بە خواردنی پیسایی خۆیان و ئەوەی دەوربەریان.

✍ .. بەراز بێ شەرمترین ئاژەڵە:-

بەراز بێ ئابڕووترین ئاژەڵە لەسەر ڕووی زەوی. تاکە ئاژەڵە لەسەر زەوی کە بانگێشتی هاوڕێکانی دەکات بۆ کاری جووت بوون لەگەڵ خێزانەکەی. لەئەمریکا کە خەڵك بەراز ئەخۆن، زۆرجار دوای ئاهەنگ و سەماکردن هەڵدەستن بە گۆڕینەوەی خێزانەکانیان لەگەڵ یەکتر. زۆرێکیان بەیەکتر دەڵێن "تۆ لەگەڵ خێزانەکەی من بخەو و منیش لەگەڵ خێزانەکەی تۆ ئەخەوم". جا بۆیە ئەگەر کەسێك بەراز بخوات ئەوا هەر وەکو بەرازیش هەڵسوکەوت دەکات.

## ١٢/ حەرامکردنی ئارەق:

پرسیار: بۆچی ئیسلام خواردنەوەی ئارەقی حەرامکردووە؟

وەڵام: ئارەق بەدرێژایی تەمەنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کێشە و بەڵابووە. بەهۆیەوە خەڵکانێکی بێشومارە گیانیان لەدەستدا و ملیۆنانی تریشی تووشی ژیانێکی پڕ لە ناجێگری دەروونی کرد. ئارەق ڕەگ و بنچینەی زۆرێك لە کێشە کۆمەڵایەتیەکانە. ئامارەکانی بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوانکاری و نەخۆشیەکانی مێشك و لێکترازانی ملیۆنان خێزان لە سەرتاپای جیهان ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەو هێزە وێرانکارییەی کە ئاڕەق هەیەتی.

✍ .. حەرامکردن ئاڕەق لە قوڕئاندا:-

قوڕئانی پیرۆز ئاڕەقی حەرامکرددوە لەم ئایەتەدا:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ ( المائدة )

✍ .. حەرامکردنی ئاڕەق لە ئینجیلدا:-

ئینجیل لەچەند شوێنێکیدا ئاڕەقی حەرامکردووە:-

- "ئاڕەق گاڵتەجارییە، خورادنەوەی بڕێکی زۆر دەبێتە بارگرژیی، هەروەها هەرکەسێك بەهۆیەوە هەڵخەڵەتێنرا مانای وایە ئەو کەسە ژیر نیە." "پرۆڤێربس ٢٠:١"

- "هەروەها سەرخۆش مەکە بە شەراب" "ئیفیسیان ٥:١٨"

✍ .. ڕووداوەکانی داوێن پیسی و دەستدرێژی سێکسی و ئایدز زۆرتر لەوانەدا ڕوودەدات کە ئارەقخۆرن:-

بەگوێرەی ئامارێکی "NationalCrimeVictimization" " قوربانیەکانی تاوانی نیشتیمانی" نوسینگەی داد لە بەشی دادی ئەمریکا، لەساڵی ١٩٩٦ لەهەر ڕۆژێکدا نزیکەی (٢٧١٣) حاڵەتی دەستدرێژیکردنی سێکسی تۆمارکراون. ئامارەکان ئەوەش دووپات دەکەنەوە کە زۆربەی ئەوانەی دەسدرێژیان کردووە سەرخۆشبوونە و پاشان تاوانەکەیان ئەنجامداوە. هەر بەگوێرەی ئامارەکان، (٪ ٨)ی ئەمریکیەکان لەسنووری خێزەکەیان و لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیان یاخود لەگەڵ خزمە نزیکەکانیان کاری داوێن پیسی ئەنجام ئەدەن. ئەمەش بەڕادەیەك کە لەهەر (١٢ تا ١٣) ە کەس، کەسێك ئەم کارە ئەنجام دەدات. زۆربەی حاڵەتەکانیش دەرئەنجامی سەرخۆشبوونی یەکێك یاخود هەردوو کەسەکەن کە بەم کارە هەڵدەستن.

لەلایەکی تریشەوە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی پشت نەخۆشیەکی کوشندەی وەکو ئایدز بریتیە لە ئارەق خواردنەوە و سەرخۆشبوون.

✍ .. هەموو سەرخۆشێك لەسەرەتادا "بخۆرێکی کۆمەڵایەتی" بووە:-
زۆرێك کەس ناویان لەخۆیان ناوە "بخۆرێکی کۆمەڵایەتی"ین بەوەی کە ئەوان تەنها بڕێکی کەم و بەشێوەیەکی شارستانی و کۆمەڵایەتیانە دەخۆنەوە، هەربۆیەشە ئەوان سەرخۆش نابن. لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان خستۆتە ڕوو کە هەموو سەرخۆشێك لەسەرەتادا "بخۆرێکی کۆمەڵایەتی" بووە. هیچ سەرخۆشێك نیە کە لەسەرەتادا ئامانجی سەرخۆش بوون و مەست بوون بێت. هیچ ئارەق خۆرێك نیە بتوانێت بڵێت من مامەوەیەکی زۆرە ئارق ئەخۆمەوە بەڵام بەهۆی توانی خۆ کۆنترۆڵ کردنم هەرگیز بۆ جارێکیش سەرخۆش نابووم.

✍ .. ئەگەر کەسێك یەکجار سەرخۆش بێت و کارێکی هەڵە بکات ئەوا ئازاری کردنی ئەو کارە هەڵەیە هەر لەگەڵیدا ئەمێنێتەوە:-
وادابنێ ئەو "بخۆرە کۆمەڵایەتی"ە، ئەوەی بەشێوەیەکی شارستانی و بڕێکی کەم ئەخواتەوە کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدا و مەست بوو، دواتر هەڵسا بەکردنی کاری داوێن پیسی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی یاخود دەستدرێژی سێکسی کردە سەر کەسێك. با ئەم کارە دواتر پەشیمانی بەدوا بێت بەڵام بۆ مرۆڤێکی ئاسایی ئازار و هەستی تاوانباریی تا کۆتایی ژیانی لەگەڵی دەمێنێتەوە و ئازاری ئەدات.

هەردوو کەسەکەجا چ تاوانبار یاخود قوربانیەکە تووشی داڕووخانێکی سەختی دەروونی دەبن.

✍ .. حەرام کردنی ئارەق لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ):-

پێغەبەری ئازیز( ﷺ) دەفەرمووێت:

- لە پەڕتووکی "سونن ابن ماجه"دا، بەرگی (٣)، بابەت "مادده سەرخۆشکەرەکان"، بەشی (٣٠)، فەرموودەی ژمارە (٣٣٧١):-

"ئارەق و شەڕاب دایکی هەموو کارێکی خراپە و ئابڕووبەرترین کارە لە کارە خراپەکان"

- لە پەڕتووکی "سونن ابن ماجه"دا، بەرگی (٣)، بابەت "مادده سەرخۆشکەرەکان"، بەشی (٣٠)، فەرموودەی ژمارە (٣٣٩١):-

" هەرشتێکی سەرخۆشکەر کەوتە ناو بڕێکی گەورەی شتێکی تر ئەوە حەرامە، جا با بڕێکی زۆر کەمیش بێت"

ئەم فەرموودەیە هیچ بیانوویەك بۆ ئەوانە نامێنێتەوە کە دەڵێن ئێمە تەنها بڕێکی کەم دەخۆینەوە.

- نەك تەنها ئەوانەی کە ئارەق دەخۆنەوە بێبەش کراون لە بەزەیی پەروەردگار، بەڵکو ئەوانەشی کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ئارەق و خواردنەوەی هەبێت لەبەزەیی و

سۆزی پەروەردگار بێبەشن. لەهەمان سەرچاوەی پێشوو، فەرموودەی ژمارە (٣٣٨٠)دا، ئەنەس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) دەفەرمووێت:-

* اتاني جبريل فقال : يا محمد إن الله لعن الخمر ، وعاصرها ، ومعتصرها ، وشاربها، وحاملها ، والمحموله إليه ، وبائعها ، ومبتاعها ، وساقيها ، ومسقيها.

✍ .. نەخۆشیەکانی پەیوەندیدار بە ئارەقخواردنەوە:-

کۆمەڵێك هۆکاری زانستی هەیە لەپشت حەرامکردنی خواردنەوە و بەکارهێنانی ئارەق و مادده سەرخۆشکەرەکان. بەرزترین ڕێژەی ژمارەی مردن لەجیهاندا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مادده سەرخۆشکەرەکان، ملیۆنان کەس ساڵانە گیان لەدەست دەدەن بەهۆی ئالوودەبوونیان بە ئارەق و شەرابەوە.لێرەدا نامەوێت زۆر درێژەی پێبدەم بە باسکردنی هەموو ئەو نەخۆشیانەی پەیوەندیدارن بە ئارەق خواردنەوەوە، چونکە زۆرێکیان ناسراون و ئەزانرێن، بەڵام لێرەدا ئەم کۆمەڵە نەخۆشیەی خوارەوە ئاماژە پێدەدەم کە ئارەق خواردنەوەی هۆکاریانە:-

* نەخۆشی جگەر کە یەکێکە لە نەخۆشیە ناسراوەکان کە دەرئەنجامی مەی خواردنەوەیە.

* شێرپەنجەی سورێنجك، شێرپەنجەی شێرسەر وەمل، شێرپەنجەی جگەر، شێرپەنجەی ڕیخۆڵە.

* هەوکردنی ڕیخۆڵە، هەوکردنی سك، هەوکردنی پەنکریاس، هەروەها هەوکردنی جگەر. هەموو ئەم نەخۆشیانە پەریوەستن بە دەرئەنجامەکانی خوارنەوەی مەی و ئاڕەق.

* نەخۆشیەکانی دڵ و بەرزی پەستانی خوێن و تەنگە نەفەسی و سەکتەی دڵ، خواردنەوەی زۆری ئارەق هۆکاریانە.

* ئیفلیجی مێشك و ئیفلیجی لەش یاخود بەشێك لە لەش و جۆرەکانی تری ئیفلیجی پەیوەستدارن بە خواردنەوەی مەی و ئارەق.

* کەم خۆری و کەمی ڤیتامینی پێویست نەخۆشی باوەن لەنێو ئەوانەی مەی ئەخۆنەوە.

* نەخۆش کەوتنی بەردەوام کە باوە لەناو ئەوانەی ئارەق ئەخۆنەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە لاوازبوونی سیستەمی بەرگری لەش و بەرهەڵستی نەخۆشی کە بەهۆی ئارەق خواردنەوە ڕوودەدات.

* نەخۆشیەکانی سینگ ناسراوە لەناو ئارەق خۆرەکان، هەروەها هەوکردنی سییەکان و ئەو نەخۆشیانەی پەیوەندیان بە سییەکانی مرۆڤەوە هەیە جۆری ئەو نەخۆشیە باوانەن لەناو ئارەق خۆرەکان.

* لەکاتی سەرخۆشبوون و مەست بوون زۆرجار کەسی مەست بوو دەرشێتەوە، سیستەمی پەرچکرداری کۆخین کە سەلامەتی و پارێزگاری بەلەش دەدات پەکدەکەوێت. بەمەش ڕشانەوەکە بەئاسانی ئەگاتە سییەکان، کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی هەوکردنی سییەکان کە لەکۆتاییدا ڕەنگە ببێتە هۆی خنکان و مردن.

* کاریگەریی نەخۆشیەکانی مەی خواردنەوە لەسەر ئافرەت شایستەی بایەخێکی تایبەتە. ئافرەت زیاتر لە پیاو لەشی لاوازە بەرامبەر نەخۆشی جگەر کە هۆکارەکەی مەی خواردنەوە بێت. لەلایەکی ترەوە لەکاتی دووگیان بووندا خواردنەوەی ئارەق کاریگەری ترسناک و زیانبەخش ئەکاتە سەر منداڵەکە. لەگەڵ ئەمەشدا نیشانەکانی نەخۆشی منداڵ لەناو سکی دایکدا بەهۆی ئارەق خواردنەوە زیاد و زیاتر لە بواری پزیشکیدا ئەدۆزرێتەوە.

* هەروەها نەخۆشیەکانی پێست پەوەیوەندیان بە بەکارهێنانی ئارەقەوە هەیە.

* سووربوونەوەی پێست و سەر ڕووتانەوە و ....هتد

✍ .. ئارەق خواردنەوە نەخۆشیە:–

دکتۆرەکانی ئەم سەردەمە ڕایەکی زۆر ئاشکرا و ڕوون دەدەن لەسەر ئارەق خواردنەوە بەوەی کە ئارەق خوارنەوە نەخۆشیە نەوەك

ئالودەبوون. کۆمەڵەی توێژینەوەی ئیسلامی نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتووە:-

"ئەگەر مەی خواردنەوە نەخۆشی بێت، ئەوکات دەبێتە تاکە نەخۆشی کە:-

- لەناو بتڵی شووشەدا بفرۆشرێت.
- بانگەشە و ڕیکلامی بۆ بکرێت لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤار.
- مۆڵەتی پێبدرێت تا بڵاوبێتەوە.
- دەبێتە هۆی دەسکەوت و داهات بۆ حکومەت.
- دەبێتە هۆی مردنی لەناکاو لەسەر ڕێگاسەرکیەکان.
- لێکترازانی خێزان و بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوان.
- نە فایرۆس نە بەکتریا هۆکار نەبێت.

✍ .. ئارەق خواردن نەخۆشی نیە بەڵکو یەکێکە لە تەڵەکانی شەیتان:-

پەروەردگار بەزانستی ڕەها و بێ سنووری خۆی ئێمەی ئاگادارکردۆتەوە لە تەڵە و هەنگاوەکانی شەیتان. ئیسلام کە "الدین الفطرة" ناسراوە کە واتای ئایینی سروشتی مرۆڤ ئەدات. هەربۆیەش

سەرجەم ڕێنمایەکانی ئیسلام هەوڵی پاراستن و پارێزگاریکردن ئەکەن لە سروشتی مرۆڤ.کەچی ئارەق و مەی خواردنەوە لادانە لەسروشتی مرۆڤ چ لەسەر ئاستی تاك یاخود لەسەر ئاستی کۆمەڵگا. مرۆڤ بەهۆی مەی و ئارەق خواردنەوە بێ ڕێز دەبێت و پلەی دادەبەزێت بۆ خوار پلەی ئاژەڵ، ئەو ئاژەڵەی کە مرۆڤ هەمیشە خۆی پێ لەو بەرزترە. جا بۆ ئەوەی ئەم نزمبوونەوە و بێ ڕێزبوونە ڕوونەدات ئیسلام هەڵسەوە بە حەرامکردنی خواردنەوەی مەی و ئارەق.

## ١٢/ یەکسانی لە شایەتیدان:-

پرسیار: بۆچی شایەتیدانی دوو شایەتی ئافرەت یەکسانە بە شایەتێکی پیاو؟

وەڵام:-

١-✍ .. لە هەمووکاتێکدا شایەتیدانی دوو ئافرەت یەکسان نیە بە شایەتی یەك پیاو:-

لە قورئاندا لە (٣) شوێندا باسی شایەتیدانی کردووە بەڵام بەبێ ئەوەی ئاماژە بە ڕەگەز (پیاو یاخود ئافرەت) بکات:-

- لەکاتی دابەشکردنی میرات پێویستە دوو کەس وەکو شایەت هەبن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِ ﴾( المائدة :١٠٦ )

**- كاتێك دوو كەس ئامادە دەبن لەدادگا بۆ كاری تەڵاقدان:-**

﴿ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ ﴾ ( الطلاق )

**- بۆ شایەتیدان لەسەر بەیەك گەیشتنی ژن و پیاوێك، چوار شایەت پێویستە هەبن:-**

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ ﴾ ( النور )

**✍ .. تەنها لەبابەتی داریی شایەتیدانی دوو ئافرەت یەكسانە بە شایەتیدانی یەك پیاو:-**

**لەڕاستیدا وتنی ئەوەی كە شایەتیدانی دوو ئافرەت لەهەموو بارێكدا یەكسانە بە شایەتیدانی یەك پیاو تەواو بێ بنامە و ناڕاستە. تەنها لەیەك دۆخدا ئەم شایەتیدانە دروستە.لە قورئاندا نزیكەی (٥) ئایەت هەیە كە باسی شایەتیدان ئەكات بەبێ ئەوەی ناوی ئافرەت یان پیاو بهێنێت، تەنها یەك ئایەت هەیە لەقورئاندا كە باس لەیەكسانی**

شایەتیدانی یەك پیاو ئەکات بە دوو شایەتی ئافرەت، ئەویش ئایەتی (٢٨٢) لە سورەتی (البقرة). ئەوەی جێی باسە ئەم ئایەتە درێژترین ئایەتی قورئان و پەیوەندیدارە بە بابەتی دارایی و سامانەوە:-

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ (البقرة : ٢٨٢)

ئەوەی ئەم ئایەتەی قورئان لێی ئەدوێت مامەڵە و ئاڵوگۆڕە دارییەکانە. لەو مامەڵە داراییانە یاخود ئاڵوگۆڕانە کاتێك دەگەنە ڕێکەوتن وا خوازراوە کە بنوسرێتەوە و دوو شایەتیش هەبن، سەبارەت بە دوو شایەتەکە ئەوەی کە زۆر خوازراوە ئەوەی کە هەردووکیان پیاو بن بەڵام ئەگەر نەتوانرا دوو پیاو بهێنرێت ئەوەکات پیاوێك و دوو ئافرەت بۆ شایەتیدان لەسەر مامەڵەکە پێویستە هەبن. ڕەنگە کەسێك هەبێت بڵێت باشە ئەمە بۆچی؟ کەواتە لێگەڕێ با بەم نمونەیە ئەمە ڕوون بکەمەوە.

وادابنێ کەسێك دەیەوێت بۆ نەخۆشیەکی دیاریکراو نەشتەرگەری بکات، جا بۆ ئەنجامدانی ئەم نەشتەرگەریە بەسەرکەوتووی ئەو کەسە وابەباش ئەزانێت کە دوو پزیشکی نەشتەرگەری شارازە و لێهاتوو و خاوەن ئەزموون بەم نەشتەرگەرییە هەڵسن. لەحاڵەتێکدا ئەگەر ئەو دوو پزیشکەی دەست نەکەوت، ئەوە بێگومان هەڵبژاردنی دووەمی بریتی دەبێت لە پزیشکێکی نەشتەرگەری و دوو مەشقپێکراوی گشتی کە خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریس بن لە پزیشکی و نەشتەرگەری.

بەهامان شێوە لە مامەڵە داراییەکان ئامادەبوونی دوو پیاو خوازراوتر و باشترە. ئاینی ئیسلام وا دەخوازێت لە شوێنکەوتووانی کە پیاو ببێتە ئامادەکاری سەرچاوە داراییەکان بۆ خێزانەکەی. جا لەبەر ئەوەی لایەنە داراییەکە خراوەتە سەرشانی پیاو بۆیە ئیسلام بەبەراورد بە ئافرەت زیاتر داوادەکات لە پیاو کە شارەزا و ئاگادار بێت لە سروشت و چۆنیەتی مامەڵە داراییەکان. دەربارەی هەڵبژاردنی دووەم کە ئەویش یەك پیاو و دوو ئافرەت بۆ ئەوەیە کاتێك یەکێك لە ئافرەتەکان هەڵەی کرد ئەوە ئەوەکەی تر بیری بهێنێتەوە و ڕاست بکاتەوە. ئەو وشە عەرەبیەی کەلەو ئایەتەدا هاتووە بریتیە لە " تَضِلَّ " کە بەمانای "لێشێوان" یاخود "هەڵەکردن" دێت. ئەمە لەکاتێکدا زۆر کەس

لێکدانەوەی هەڵە و ناڕاستیان هەیە بۆ ئەم وشەیە بەوەی پێیان وایە کە مانای "لەبیرچوونەوە"دێت. لەکۆتاییدا هەموو ئەمانە ئەوە ئەسەلمێنن کە تەنها لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕە دارییەکان شایەتیدانی یەك پیاو یەکسانە بە شایەتی دوو ئافرەت.

✍ .. شایەتی دوو ئافرەت یەکسانە بە یەك پیاو لە حاڵەتەکانی کوشتن:-

هەندێك لەزانایان لەو بۆچوونەدان بەهۆی ئەوەی کە ئەگونجێت هەڵسوکەوت و بارودۆخی ئافرەت ڕەنگە بکەوێتە ژێر کاریگەری حاڵەتەکانی کوشتن. کاتێك ڕووداوێکی کوشتن ڕوودەدات ئافرەت زیاتر ترس دایدەگرێت و دەترسێت بەبەراورد بەپیاو،ئەم لایەنە دەروونیەی ئافرەت ڕەنگە وای لێبکات هەڵە بکات یاخود تووشی لێ تێکچوون و لێ شێواندن بێت. هەربۆیەش هەندێك لەشەریعەت ناسان و یاسادانەرەن پێیان وایە کە تەنانەت لە ڕووداوەکانی کوشتنیش پێویستە شایەتیدانی یەك پیاو یەکسان بێت بە شایەتی دوو ئافرەت. جگە لەمە لەهەموو حاڵەتەکانی تر شایەتیدانی یەك پیاو یەکسانە بە شایەتیدانی یەك ئافرەت.

**✍ .. قورئان بەڕوونی ئاماژەی پێداوە کە شایەتیدانی یەك ئافرەت یەکسانە بە شایەتیدانی یەك پیاو:-**

**هەندێك لەزاناکان لەو بۆچوونەدان کە پێویستە یاسا یەکسانی شایەتیدانی یەك پیاو بە شایەتی دوو ئافرەت لەهەموو بارو دۆخێکدا کاری پێبکرێت بەلام ئەمە هەرگیز ناتوانرێت جیٚ بەجێبکرێت چونکە لەقورئان و لە سورەتی "النور" ئایەتی (٦)دا، پەروەردگار زۆر بەڕوونی ئەوەی باسکردووە کە شایەتیدانی یەك ئافرەت یەکسانە بە شایەتیدانی یەك پیاو.**

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ ﴾ ( النور )

**✍ .. بەڕاستدانان و شایەتیدانی تەنهای عائیشە لەسەر فەرموودەیەك بەسە بۆ قەبوڵکردن و بە ڕاستدانانی:-**

**عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) کە خێزانی پێغەمبەر خۆشەویستە (ﷺ) نزیکەی (٢٢٢٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە کە هەرهەموویان بە فەرموودەی "صحیح" لەقەڵەم دەدرێن. کە ئەمەش بەڵگەیەکی یەکجار ڕوون و بەهێزە لەسەر ئەوەی کە شایەتی یەك ئافرەت بەهەمان شێوە قەبوڵکراوە و نرخ و بایەخی هەیە.**

هەندێك لە زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە شایەتی یەك ئافرەت بەسە لە بینینی مانگ لەمانگی ڕەمەزان. تێڕامێنە لەوەی کە شایەتی و بینینی یەك ئافرەت بەسە و بڕواپێکراوە بۆ یەکێك لە پایەکانی ئیسلام کە ئەویش بەڕۆژبوونی مانگی ڕەمەزان، تەواوی کۆمەڵگای ئیسلامی بە پیاو و ژنەوە شایەتی ئەو ئافرەتە قەبوڵدەکەن. لەلایەکی ترەوە هەندێك لە زانایان پێیان وایە یەك شایەتی بۆ سەرەتای ڕەمەزان و دوو شایەت بۆ کۆتای ڕەمەزان پێویستن بەبێ ئەوەی لەهەردوو بارودۆخەکەدا ڕەگەز گرنگ یاخود بایەخی هەبێت.

✍ .. لەهەندێك حاڵەتدا شایەتیدان و ئامادەبوونی ئافرات خوازراوترە:—

لەهەندێك کاتدا ئامادەبوون و شایەتیدانی ئافرەت خوازراوترە و قەبوڵکراوترە و شایەتیدان و ئامادەبوونی پیاو نەخوازراوە. بۆ نموونە ئەو حاڵەتانەی کە پەیوەندیدارن بە ئافرەتەوە وەکو کاتی شۆردنی مردوویەکی ئافرەت، کە ئەوکات پێویستە مردووشۆرەکە ئافرەت بێت. ئەو نایەکسانیەی (کە تەنها لەڕووالەتی دەرەوەیدا وادەردەکەوێت بۆ هەندێك کەس ئەگینا نایەکسانی نیە)لە نێوان شایەتیدانی ئافرەت و پیاو لە مامەڵە داراییەکان هیچ کات بەهۆی جیاوازی ڕەگەزی ئەم

دووانە نیە، بەڵکو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی سروشت و ڕۆڵی پیاو و ئافرەت لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا.

## ١٤/ میرات:-

پرسیار: بۆچی بەگوێرەی شەریعەتی ئاینی ئیسلام لەمیراتدا ئافرەت نیوە بەشی پیاوێکی بەردەکەوێت؟

وەڵام:

✍ .. میرات لە قورئاندا:-

قورئانی پیرۆز زۆر بەووردی و پوختی ڕێنماییەکانی دابەشکردنی میرات و سامانی باسکردووە بەسەر سوودمەندە ڕاستەقینەکانی میرات. ئەو ئایەتانەی ڕێنماییەکانی دابەشکردنی میراتی لەخۆگرتووە ئەمانەی خوارەوەن:-

سورەتی (البقرة)، ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾

سورەتی (البقرة)، ﴿ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ ﴾

**سورەتی (النساء)،** ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾﴾

**سورەتی (النساء)،** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾﴾

**سورەتی (النساء)،** ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِىَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ ۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾﴾

**سورەتی (المائدة)،** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

✍ .. بەشی تایبەت لەمیراتدا بۆ کەسە نزیکەکانە:-

لەقورئاندا سێ ئایەت هەیە کە بەووردی باس لە بەشی کەسە نزیکەکان لە میراتدا دەکات . سێ ئایەتەکەش لەسورەتی (النساء)ن کە ( ١١ – ١٢ – ١٧٦) :-

﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ ﴾

﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾

**✍ .. هەندێکجار ئافرەت هەمان بڕ یاخود زیاتر لە بەشی پیاوێك لەمیراتدا وەردەگرێت:-**

لەهەندێك حاڵەتدا ئافرەت نیوەی بەشی ئەوەی پیاو وەریدەگرێت لە میراتــدا وەردەگرێــت، بــەڵام ئــەوەش دەبێــت بووترێــت ئەمــە لەهەمووکاتێکدا چۆنیەك نیە. لەحاڵەتێکدا مردووەکە لە باوانیدا کەسی نەمابێتەو و منداڵیش نەبوو جگە لە برا و خوشکی، ئەوکات هەردووکیان یەك لەسەر شەشی میراتەکەیان بەردەکەوێت. ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو ئەوکات دایك و باوکەکە بڕێکی یەکسان وەردەگرن کە یەك لەسەر شەشە بۆ هەریەکێکیان. لەهەندێك حاڵەتی دیاریکراو ئافرەت دوو ئەوەندەی بەشی پیاوێك وەردەگرێت. بۆ نموونە ئەگەر مردووەکە ئافرەتێك بوو کە منداڵ و خوشك و برای نەبوو، لە کەسی نزیکیشتەنها هاوسەر و دایك و باوکی هەبوو. ئەوکات هاوسەرکەی نیوەی میراتەکە وەردەگرێت، لەکاتێکدا دایکەکە یەك لەسەر سێ و باوکەکەش یەك لەسەر شەش وەردەگرێت. بەمەش دایکەکە دووئەوەندەی ئەو بڕە وەردەگرێت لە میرات کە باوکەکە وەریدەگرێت.

✍ .. عادەتەن ئافرەت نیوەی بەشی پیاوێکی لەمیراتدا بەردەکەوێت:-

ئەوە ڕاستە کە وەك پێوەرێکی گشتی و لەزۆرکاتدا ئافرەت نیوەی ئەوبەشە لەمیرات وەردەگرێت کە پیاوێك بەریدەکەوێت، بۆ نموونە لەم دۆخانەدا:-

- کچ نیوەی بەشی کوڕێك لەمیراتدا وەردەگرێت.

- خێزان یەك لەسەر هەشت و هاوسەریش یەك لەسەر چوار وەردەگرێت ئەگەر منداڵی نەبوو.

- خێزان یەك لەسەر چوار و هاوسەریش یەك لەسەر دوو وەردەگرێت ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو.

- ئەگەر مردووەکە نە باوك و دایکی مابوو، هەروەها نە منداڵیشی هەبوو. ئەوکات خوشکەکەی نیوەی ئەو بەشەی لەمیرات بەردەکەوێت کە براکەی وەردەگرێت.

✍ .. پیاو دووئەوەندی ئافرەت وەردەگرێت لەمیرات چونکە ئەو دەبێت لەڕووی داراییەوە یارمەتی خێزانەکەی بدات:-

لەئایینی ئیسلامدا ئافرەت هیچ ئەرکێکی دارایی لەسەر نیە، ئەمە لەکاتێکدا ئەرکە داراییەکانی خێزان خراوەتە سەرشانی پیاو. پێش ئەوەی ئافرەتێك ژیانی هاوسەری پێك بێنێت ئەوە لەلایەن باوك و

برایـــەوە سەرپەرشـتی دەکرێـت و پشـتگیری لێـدەکرێت لەســەرجەم پێداویستیەکان ژیانیدا. ئەو کاتەشی کە ئافرەتەکە خێزان پێکدێنێت، سەرپەرشـتیکردن دەبێتـە ئـەرکی سەرشـانی هاوســەر و کوڕەکـەی. ئیسـلام بەرپرسیارییەتیە داراییەکانی خستۆتە ئەستۆی پیـاو تـاکو بتوانێـت تـەواوی پێداویستیەکانی خێـزان دابین بکـات. جا بۆئـەوەی پیـاو بتوانێـت ئـەم بەرپرسـیاریەتیە جـێ بـەجێ بکـات دووئەوەنـدەی بەشی ئافرەتێکی لەمیرات بەردەکەوێت. با نموونەیەك بهێنینەوە، ئەگەر کەسـێك مـرد و بـڕی یـەك هـەزار و پێـنج سـەد دۆلاری لـەدوای خـۆی جێهێشـت ئـەوکات لەمنداڵـەکانی (یـەك کـوڕ و یـەك کـچ)، کوڕەکـە یـەك هەزارەکە و کچەکەش پێنج سەد دۆلارەکە وەردەگرێت لەمیرەتەکە. لـەو یـەك هـەزار دۆلارە کـە کوڕەکـە وەریگرتـووە، وەکوئـەرکی سەرشـانی بەرامبـەر خێزانەکـەی ئـەوە ڕنگـە هـەموو ئـەو بـڕە سـەرف بکـات یـاخود ڕەنگـە هەشـت سـەد دۆلار لـەوبڕە سـەرف بکـات. بـەم پێیـەش کوڕەکـە بڕێکـی زۆر کـەمی بـۆ دەمێنێتـەوە. لەلایـەکی تـرەوە کچـەکە لـەو بـڕەی وەریگرتـووە دەتوانێـت سـەرفی نـەکات و هـەر هـەمووی هـەڵبگرێت بـۆ خۆی. بۆیە لێردا ئەپرسم باشە تۆ کامیان بەباشتر ئەزانی، وەرگـرتنی یـەك هـەزار دۆلار و سـەرفکردنی هەشـت سـەد دۆلار لـەو بـڕە یـاخود وەرگرتنی پێنج سەد دۆلار و هـەڵگرتنی تـەواوی ئـەو بڕە پارەیـە بـەبێ ئەوەی پێویست بکات سەرفی بکات.

## ١٥/ ئایا قورئان وتەی خوایە؟

پرسیار: ئایا ئەتوانی بیسەلمێنێت کە قورئان وتەی پەروەردگارە؟

وەڵام : وەڵامی ئەم پرسیارە لە یەکێك لە بەرهەمەکانی داهاتوومان‌دا بەناوی ئایا قورئان وتەی خودایە ؟ ( وەڵام دەدرێتەوە )

## ١٦/ ڕۆژی دوایی:-

پرسیار: چۆن ئەتوانی بوونی ڕۆژی دوایی بسەلمێنێت؟

وەڵام:

✍ .. ئایا بڕواکردن بە ڕۆژی دوایی لەسەر بناغەی باوەڕ و تێگەیشتنێکی کوێرانە نیە؟

زۆرکەس پێیان وایە ناکرێت کەسێکی خاوەن زانست و ژیری باوەڕی بەژیانی دوای مردن هەبێت. هەروەها هەر ئەو کەسانە لەو بۆچونەدان ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی ئەو بڕوایەیەن لەسەر بناغەیەکی کوێرانە دامەزراندووە. باوەڕی من بە ڕۆژی دوایی لەسەر بناغەی تێگەیشتنێکی زانستی و باوەڕێکی ژیرانە دامەزراوە.

✍ .. ڕۆژی دوایی باوەڕێکی لۆژیکی و بابەتیانەیە:

نزیکەی هەزار ئایەت هەیە لەقورئانی پیرۆز کە کۆمەڵێك ڕاستی زانستی تێدایە دەربارەی ڕۆژی دوایی "بڕوانە پەرتووکەکەم (قورئان و زانستی سەردەم- لە هەماهەنگیدان یاخود دژایەتیدا)". زۆر ڕاستی و حەقیقەت کە لەقورئاندا باسکراوان کە لەم سەردەمانەی دوایدا دۆزراونەتەوە، بەڵام زانست نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بتوانێت هەموو ڕاستیەکانی قورئان پشت ڕاستبکاتەوە. ئێستاش وادابنێ (٨٠٪) ئەوەی لەقورئان باسکراوە، سەلمێنرا کە ڕاستن و بەتواوی پشت ڕاست کرانەوە. بەڵام سەبارەت بەو (٢٠٪)ی کە دەمێنێتەوە زانست ناتوانێت قسەیەکی یەکلایکەرانەوە و جێگیری هەبێت لەسەر بەهۆی ئەوڕاستیەی کە زانست لەو ئاستەدا نیە کە بیسەلمێنێت یاخود ڕەتی بکاتەوە. بەو زانستە سنووردارەی کە مرۆڤ هەیەتی ناتوانێت بڵێت کە ئەو (٢٠٪)ی قورئان یاخود تەنانەت ئایەتێکیش هەڵەیە. هەربۆیەش کاتێك (٨٠٪) لەسەدا سەد ڕاست بێت و (٢٠٪)یشی نەتوانرێت بسەلمێنرێت کە ڕاستە یاخود نا، ئەوکات ژیری دەڵێت ئەو (٢٠٪)یش بەهامان شێوە ڕاست و درووستە. بوونی ڕۆژی دوایی کەلەقورئاندا باسکراوە دەکەوێتە ئەو (٢٠٪)ە، ئەو بەشە نادیارەی کە ژیریم پێمدەڵێت ئەو بەشەش ڕاست و دروستە.

**.. چەمکی ئاشتی و بەهای مرۆڤایەتی بێ مانا و بێ بایەخ دەمێنێتەوە بەبێ بوونی ڕۆژی دوایی:-**

ئایا دزیکردن کارێکی باشە یاخود خراپە؟ بێگومان وەڵامی مرۆڤێکی ئاسایی بۆ ئەم پرسیارە بریتی دەبێت لەوەی کە کارێکی خراپە. باشە کەسێك کە باوەڕی بەڕۆژی دوایی نیە چۆن ئەتوانێت قەناعەت بەتاونبارێکی بەهێز و لێهاتوو بکات کە دزیکردن کارێکی هەڵەیە؟.

وادابنێ کە من تاوانبارێکی بەهێز و کاریگەرم لەجیهاندا و لەهەمان کاتدا کەسێکی تێگەیشتووم و مەنتقیم، بۆیە پێم وایە کە دزیکردن کارێکی باشە و چاکە چونکە یارمەتیم دەدات تابتوانم ژیانێکی نایاب بۆخۆم چنگبخەم. بۆیە بۆمن دزیکردن کارێکی چاکەو و دروستە. لەبەرمبەردا ئەگەر کەسێك هەبێت کە بۆچوونێکی بابەتیانەی هەبێت و بیسەلمێنێت بۆم کەوا دزیکرد کارێکی هەڵەیە ئەوا ڕاستەوخۆ وازدەهێنم. زۆرکات ئەو کەسانە بەم شێوەیە دەست بە گفتوگۆ دەکەن:-

**- ئەو کەسەی دزیەکەی لێدەکرێت تووشی زەحمەتی و ناخۆشی دەبێت:-**

ڕەنگە هەندێك کەس بڵێت ئەو کەسەی کە دزیکەی لێدەکرێت تووشی زەحمەتی دەبێت. بەدڵنیاییەوە من هاوڕام لەگەڵ ئەم قسەیە کە

دزیکردن خراپە بۆ کەسی دزیلێکراو، بەڵام بەبڕاوی دزیکرن باشە بۆمن. بۆ نموونە ئەگەر من یەك هەزار دۆلار بدزم ئەوکات ئەتوانم ژەمێکی بەتام و چێژ لە جێشتخانەیەکی پێنج ئەستێرەیی بخۆم.

- ڕەنگە کەسێکی تر بتوانێت دزی لەتۆش بکات:-

هەندێك کەس ڕەنگە بڵێن ڕۆژێك دێت کە دزی لەتۆش بکەن، بەڵام کەس ناتوانێت دزی لەمن بکات، چونکە من دزێکی بەدەسەڵاتم و بەسەدان پاسەوانم هەیە. من ئەتوانم دزی بکەم لەهەموو کەسێك لەکاتێکدا کەس ناتوانێت دزی لەمن بکەم. ڕەنگە دزیکردن کارێکی پڕ مەترسی بێت بۆ کەسانی ئاسایی، بەڵام بۆ کەسێکی بەهێز و کاریگەری وەك من بەو ڕادەیە پڕ مەترسی نیە.

- ڕەنگە پۆلیس دەستگیرت بکات:-

هەندێك کەس دەڵێن ئەگەر تۆ بەردەوام بیت لەدزیکردن ئەوە ڕۆژێك دێت کە لەلایەن پۆلیسەوە دەستگیردەکرێت. بەڵام خۆ تەنانەت پۆلیسش لایەنگری من، بگرە من پاڵپشتی کەسانی دەسەڵاتداریشم هەیە. من ئەزانم ئەگەر کەسێکی ئاسایی دزی بکات ئەوا دەستگیر دەکرێت، بەڵام نەك بۆ کەسێکی بەدەسەڵات و کاریگەری وەکو من.

بۆیە یەك هۆکاری بابەتیانەم پێ بڵێ کە دزیکرن خراپە ئەوکات ڕاستەوخۆ دەستی لێ هەڵدەگرم.

- ئەو پارەیەی کە ئەیدزیت بە ڕەنجی سەرشانی خۆت بەدەستت نەهێناوە:-

هەندێك كەس ڕەنگە بڵێن ئەو پارەیەی کە ئەیدزیت بەماندووبوون و هەوڵدانی خۆت دەستت نەهێناوە، بەڵکو ئاسان و ئامادەکراوە بۆت. بێگومان منیش هاوڕام لەوەی کە ماندووبوونی خۆم ئەو بڕە پارەیەم دەست نەکەوتووە، هەرلەبەرئەوەشە کە دزیکردنم هەڵبژاردووە، چونکە پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەیت بۆ پارە پەیداکردن. من ئەپرسم ئەگەر کەسێك دوو هەڵبژاردنی هەبێت لەنێوان دەستکەوتنی پارە بەڕێگایەکی ئاسان یان بەڕێگایەکی زەحمەت و گران، ئەوە بێگومان هەموو کەسێکی خاوەن ژیری ڕێگا ئاسانەکە هەڵدەبژێرێت.

- دزیکردن دژی مرۆڤایەتیە:-

ڕەنگە هەندێك كەس بڵێن ئەوە کارێکی نامرۆڤانەیە و مرۆڤ پێویستە لەخەمی مرۆڤەکانی تر بێت و بایەخ بە هەشتیان بدات. منیش ئەپرسم باشە کێ ئەویاسایەی دانەوە کە پێیدەڵێن "مرۆڤایەتی"؟، پاشانیش بۆچی من ئەبێت شوێنی بکەوم؟. ڕەنگە ئەم یاسایە شیاو و کاریگەر بێت بۆ کەسانێك کە هەست و سۆز بەسەریاندا زاڵە، بەلام بۆ کەسێکی وەکو من کە پشت بەژیری و عەقڵ دەبەستم ئەو کاریگەریەی نیە و بێ

مانایە بەلامەوە. ئەوەتا کاتێك ژیریم بەکاردێنم و بابەتیانە بیرئەکەمەوە ئەبینم کە بایەخدان بە هەست وسۆزی کەسانی تر هیچ سودێکم پێناگەیەنێت.

- دزیکردن کارێکی خۆپەرستانەیە:-

هەندێك کەس ڕەنگە بڵێن دزیکردن کارێکی خۆپەرستانەیە، منیش ئەڵێم باشە ڕازیم بەوەی کەوا کارێکی خۆپەرستانەیە بەلام بۆچی خۆپەرست نەبم کە بەهۆیەوە ژیانێکی خۆش و نایاب بژیم؟

✍ .. هیچ بەڵگەیەکی بابەتیانە نیە بیسەلمێنێت کە دزیکردن کارێکی خراپە:-

کەواتە سەرجەم ئەو بۆچوونانەی کە هەوڵی بەخراپ دانانی دزیکردن دەدەن بێ بنەما و بێ مانا بوون. ڕەنگە ئەم بۆچوونانە قەناعەت بەکەسێکی ئاسایی بهێنن بەلام بێگومان بۆ تاوانکارێکی بەدەسەلات و کاریگەری وەکو من نا. کەواتە هیچ یەکێك لەو بۆچوونانە نەیانتوانی خۆرابگرن لەبەردەم مەنتق و ژیریی. جابۆیە هیچ جێگای سەرسامی نیە کە لەجیهاندا ئەو ژمارە زۆرەی تاوانکاران ئەبینین.

بەهەمان شێوە دەستدرێژیکردنی سێکسی و خیانەت و تاوانەکان تر، بۆ کەسێکی وەکو من کاری باشن و هیچ بەڵگەیەکی بابەتیانە نابینم کە بتوانێن ڕازیم بکات بەوەی کەوا کاری خراپ و هەڵەن.

✍ .. موسوڵمان ئەتوانێت قەناعەت بە تاوانکارێکی بەهێز و چالاك بكات:-

ئێستا با سەرجەم شتەکان پێچەوانە بکەینەوە، وادابنێ تۆ تاوانکارێکی بەدەسەڵات و کاریگەریت لەجیهاندا، تۆ کەسێکیت هەم پۆلیس و هەم کەسانی دەسەڵاتدار لەپشتتن، هەروەها سوپایەك لەکەسی پیاوکوژ و چەتە لەدەورتن. منیش موسڵمانێکم و هەوڵدەدەم بۆتی بسەلمێنم کە دزیکردن و دەستدرێژیکردن و خیانەت کارێکی هەڵە و تاوانن. ئەگەر بێت و هەمان ئەو قسانەی سەرەوە دووبارە بکەمەوە، ئەوکات هەمان وەڵامان دەست دەکەوێتەوە.

✍ .. هەموو مرۆڤێك داپەروەری دەوێت:-

هەموو مرۆڤێك حەزی لەداپەروەریە، ئەگەرچی ئەو کەسە دادپەروەری بۆکەسانی تر نەوێت بەڵام بۆ خودی خۆی دەوێت. هەندێك کەس بەهۆی ئەوەی کە مەست بوونە بە هێز و دەسەڵات و کاریگەربوون بۆیە دەستیان داوەتە ئازاردان و ناڕەحەتکردنی کەسانی تر. کەچی هەر ئەو کەسە تاوانکارانە حەز بەوە ناکەن کە نادادپەروەریان بەرامبەر بکرێت. هۆکاری ئەوەشی کە ئەوان بێ هەست وسۆز و بەزەیین بەرامبەر ئازار و ناخۆشی کەسانی تر ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەوان هێز و

کاریگـەربوون و دەسـەڵات دەپەرسـتن. ئـەوان لەوبڕوایـەدان کـە هێـز و کاریگـەربوون و دەسـەڵات نـەك ئـەوەی تـەنها نادادپەروەریـە بەرامبـەر کەسانی تر بەڵکو هۆکارێکا کە ئەوان خۆیان پێ دەپارێزن لە ستەم و نادادپەروەری کەسانی تر.

✍ .. پەروەردگار بەهێزتر و دادپەروەرترە:-

وەکو موسڵمانێك هەوڵی قەناعەت کردنی تاوانکارەکە دەدەم بەوەی کە خوایەکی بەهێز و بەتوانا هەیە. پێی دەڵێم کە ئەو خوایە لەتۆ بەهێزتر و دەسـەڵاتدارترە و ئـەو خوایـەکی دادپـەروەرە. قورئـانی پـیرۆز بـەم شێوەیە دەدوێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴾( النساء : ٤٠)

✍ .. بۆچی پەروەردگار سزای من نادات:-

لەبەرئـــەوەی تاوانکارەکـــە کەســـێکی زانســـتیە و مـــەنتق و ژیـــری بەکاردێنێت بۆیە پاش ئەوەی لەڕێگای ڕاستیە زانستیەکانی قورئان ئەگاتـە ئـەو بڕوایـەی کـە پـەروەردگار بـوونی هەیـە بـەلام ڕەنگـە ئـەو بپرســێت و بڵێــت باشــە ئەگــەر پــەروەردگار بەوڕادەیــە بــەهێز و دادپەروەرە، ئەی بۆچی سزای من نادات ؟

✍ .. ئەوانەی کە ستەم و نادادپەروەری ئەکەن پێویستە سزابدرێن:-

هەرکەسێك کە ستەمی لێکرابێت، بەبێ ئاوڕدانەوە لەلایەنی پێگەی کۆمەڵایەتی و باری دارایی ئەوە بێگومان ئەوکەسە حەز ئەکات کە کەسی ستەمکار سزابدرێت. هەموو کەسێك حەز ئەکات کەسانی دزیکەر و دەستدرێژیکەر سزابدرێن. هەرچەند ئەو تاوانکارانە سزادەدرێن بەڵام سزادانەکە بەو ڕادەیە نیە کە شیاوی تاوانەکەیان بێت. ئەگەر بێت و تاوانکارێکی بەهێز و کاریگەر لەلایەن تاوانکارێکی بەهێزتر و کاریگەرتر ستەمی لێبکرێت، ئەوە ستەم لێکراوەکە هەر حەزدەکات تاوانکارە ستەمکارەکە سزا بدرێت.

✍ .. ئەم ژیانە تاقی کردنەوەیە بۆ ڕۆژی دوایی:-

ئەم ژیانە گۆڕەپانی تاقیکردنەوەیە بۆ ڕۆژی دوایی، لەم باریەوە پەروەردگار بەم شێوەیە ئەدوێت لەقورئانی پیرۆز:-

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ ( الملك )

✍ .. کۆتا دادپەروەری لە ڕۆژی دوایدایە:-

قورئانی پیرۆز لەشوێنێکدا بەم شێوەیە ئەدوێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ ( آل عمران )

ڕۆژی دوایــی شــوێنی کۆتــا دادپەروەریــە. کاتێــك مرۆڤــەکان دەمــرن ئــەوکات پــەروەردگار لــەڕۆژی دوایــدا هەرهــەموویان زیندوودەکاتــەوە. دەشێت کەسێك بەشێك لـە سزاکەی هـەر لـەدونیادا وەربگرێـت بـەلاّم بێگومـان ســزا و پاداشــتی کۆتــای هــەر لــەڕۆژی دوایدایــە. ڕەنگــە پەروەردگار لەدونیادا سزای کەسانی دز و دەستدرێژیکار نـەدات بـەلاّم بێگومـان ئـەو لـەڕۆژی دوایـدا لێپرسینەوەیان لەگـەڵ دەکـات و پاشـان سزایان دەدات.

✍ .. یاساکانی مرۆڤ چ سزایەکی بۆ "هیتلەر" داناوە:-

هیتلەر (٦) ملیۆن جوولەکەی لـەماوەی فەرمانڕەوایـەتی و دەسـەلاّتیدا ســووتاند. ئەگــەر بهاتبــا پۆلیســش "هیتلــەر"یان دەســتگیر بکردایە،ئـەوکات یاسـاکانی مـرۆڤ چ سـزایەکیان دەبـوو بـۆ هیتلـەر تـا دادپـەروەری بەرقەراربکـەن؟ ئـەوەی لەدەسـتیان بوایـە لـە سـزادان ئـەوە دەبوو کە "هیتلەر" بخەنە ئەو ژووره غازەی کەجوولەکـەکانی تێدابوو. بـەلاّم خـۆ ئەمـە تـەنها سـزای کوشـتنی یـەك جوولەکەیـە، ئـەی چـی دەربارەی جوولەکەکانی تر؟

✍ .. پــەروەردگار ئــەتوانێت (٦) ملیــۆن جــار "هیتلــەر" لــەئاگری دۆزەخدا بسوتێنێت:-

پەروەردگار بەم جۆرە لەقورئانی پیرۆز ئەفەرمووێت:-

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ ( النساء )

✍ .. چەمکی بەهای مرۆڤ، یاخود چاك و خراپ بێ واتا ئەمێننەوە بەبێ بوونی چەمکی ڕۆژی دوایی:-

هەموو ئەو ڕاستیانەی سەرەوە ئەوە دەردەخەن کە بەبێ قەناعەت هێنان بە کەسێك بەبوونی ڕۆژی دوایی یاخود ژیانی دوای مردن ئەوە چەمکی بەهای مرۆڤ، یاخود چاك وخراپ بێ مانا ئەمێننەوە، بەتایبەتی بۆ تاوانکاری بەدەسەلاَت و کاریگەر کە ستەم و کاری ناڕەوا دەکات.

## ١٧/ بۆچی موسڵمانان بۆ چەند کۆمەڵ و مەزهەبێکی فکری جیاواز دابەش بوون؟

پرسیار: ئەگەر موسڵمانان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا ئەوان شوێنی یەك قورئان کەوتوون ئەی بۆچی ئەبینین دابەش بوونە بۆ کۆمەڵ و مەزهەبی فکری جیاواز ؟

وەڵام:

✍ .. موسوڵمانان پێویستە یەکگرتوو و یەکڕیز بن:-

بەڵێ ئەوە زۆر ڕاستە کە موسڵمانان لەئێستادا لەنێو خۆیان پەرتەوازە بوونە، کارەساتە گەورەکەش لەوەدایە کە ئیسلام هەرگیز بەو پەرتەوازە بوونە ڕازی نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئیسلام هەوڵی یەکڕیزی و یەکگرتووی نێوان شوێنکەوتووانی داوە. قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە ئەدوێت:﴿ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ ( آل عمران )

دەبێت ئەو ڕشتەیەی پەروەردگار لەم ئایەتە داوای لێکردووین دەستی پێوە بگرین چی بێت؟. ڕشتەی پەروەردگار لەم ئایەتەدا بەمانای

قورئـان دێـت، بەمـەش قورئـانی پـیرۆز ئـەو ڕشـتەیە کـە پێویسـتە موسڵمانان هەرهەموویان دەستی پێوە بگرن. پەروەردگار لەم ئایەتەدا دووجار جەخت دەکاتەوە لە یەکگرتن و یەکڕیزیی موسڵمانان بەوەی لەیەکەمیاندا دەفەرموێت (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا) لەدووەمیشدا دەفەرموێت (وَلَا تَفَرَّقُوا). لەشوێنێکی تردا پەروەردگار بەم شێوەیە دەفـــــەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾ (النساء)

بەمەش دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە موسوڵمانان هەرهەموویان پێویستە یەکڕیز بن لەشوێنکەوتنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و پەرتەوازە و لێکدابڕاو نەبن.

✍ .. لەئیسلامدا ڕێگەنەدراوە بەدروستکردنی کۆمەڵ و گروپی جیاواز:-

قورئـانی پـیرۆز دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الأنعام)

لـەم ئایەتـەدا پـەروەردگار داوامـان لێدەکـەت خـۆ بـەدووربگرین لـەو کەسـانەی کـە هـەوڵی دابەشـکردنی ئـاین دەدەن بـۆ چـەند گـروپ و کۆمـەڵێك. بـەڵام گـەر لەئێسـتادا لـە موسـڵمان بپرسـیت تۆچیت؟ ئـەوە لەوەڵمدا پێت دەڵێت من سونیم یاخود شیعەم، یاخود ڕەنگە هەندێکی تریان پێت بڵێت من حەنەفیم، شافعیم، حەمبەلیم...هتد.

✍ .. پێغەمبەرمان (ﷺ) موسوڵمان بوو:-

ڕەنگە کەسێك لەو جۆرە موسوڵمانانە بپرسێت باشە، ئەی پێغەمبەرمان (ﷺ) چی بوو؟ ئایا ئەو شافعی بوو؟، حەمبەلی بوو؟ یان مالیکی بوو؟. وەڵامی ئەم پرسیارانە هەموو نەخێرە، چونکە هاوشێوەی سەرجەم پێغەمبەرانی پێش خۆی موسوڵمان بووە. لەقورئاندا پەروەردگار بەمشێوەیە دەفەرموێت:-

﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾﴾ ( آل‌عمران )

لەهەمان سورەتدا پەروەردگار ڕوونی دەکاتەوە کە پێغەمبەر "ئیبراهیم" نە جوولەکە بووە، نە مەسیحی بوو، بەڵکو ئەویش موسوڵمان، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾﴾ ( آل عمران )

✍ .. قورئان داوامان لێدەکەت خۆمان بە موسوڵمان ناوببەین:-

* ئەگەر کەسێك لەموسوڵمانێکی پرسی "تۆ چیت؟" ئەوە پێویستە لەوەڵامدا بڵێت " من موسوڵمانم." و وەڵامی وەکو حەنەفیم، شافعیم و ئەوانی تر واز لێبێنێت. ئەوەتا پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا وا ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ ( فصلت )

* کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نامەی ئەنووسی بۆ پادشا و فەرمانڕەوا بێ باوەڕەکان تا بانگێشتیان بکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئایەتێکی سوڕەتی (آل عمران) بۆ دەنووسین، کە پەروەردگار تێیدا بەم شێوەیە ئەفەرموێت:- ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾

.. ڕێزگرتن لەزانا گەورەکانی ئاینی ئیسلام:-

پێویستە کەوا ڕێزبگرین لەهەموو زانا مەزنەکانی ئیسلام بەهەر چوار ئیمامەکەشەوە (ئیمامی ئەبو حەنیفە، ئیمامی شافعی، ئیمامی حەمبەل، ئیمامی مالیك) ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت. ئەوان زانا و تێگەیشتووی لێهاتوو بوون و داواکارین لە پەروەردگار کە پاداشتی ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوون و تێکۆشانەیان بداتەوەکە لەپێناو ئاینی ئیسلامدا کردوویانە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بووترێت ئەوەیە کە ناتوانین کەسێك ڕەتبکەینەوە هەر لەبەر ئەوەی کە بۆچوونێکی ئیمامی شافعی یاخود ئیمامی مالیکی پێ باشتر و پەسەندترە، بەڵام پێویستە کاتێك پرسیاری لەو کەسە کرا "تۆ چیت؟"، لەوەڵامدا بڵێت من موسوڵمانم.

ڕەنگە هەندێك کەس ئاماژە بدەن بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەپەڕتووکی "سونن ابو داود"دا هاتووە کە فەرموودەی ژمارەی

(٤٥٧٩)یە. لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (ئومەتەکەم دابەش دەبێت بۆ(٧٣) کۆمەڵ). ئەم فەرموودەیە ئەوە دەردەخات کە پێغەمبەر پێشبینی دابەشبوونی ئومەتەکەی کردووە بۆ (٧٣) کۆمەڵ، نەوەك ئەوەی کە ئەو داوای کردبێت کە موسوڵمانان هەستن بە دروستکردنی کۆمەڵە و گروپی جیاواز، چونکە قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە دابەشکردن و پەرتەوازییەی قەدەغەکردووە. ئەوانەی کەوا شوێنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون و گروپ و کۆمەڵەی جیاواز دروست ناکەن، هەر ئەوانە لەسەر ڕێگای ڕاست و دروستن. بەگوێرەی فەرموودەیەك کە (ترمژی) ڕیوایەتی کردووە، کە فەرموودەی ژمارە (١٧١)ە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ئومەتەکەمدابەش دەبێت بۆ"٧٣" کۆمەڵی جیاواز، هەرهەموویان بۆ ئاگری دۆزەخن تەنها یەکێکیان نەبێت.) هاوەڵەکانیش پرسیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کۆمەڵەیە کێن؟، ئەویش لەوەڵامدا وتی (ئەوان ئەو کۆمەڵەیەن کە خۆم و هاوەڵەکانم بۆی دەگەڕێنەوە). قورئانی پیرۆزیش لەزۆر ئایەتدا ئاماژەی داوە بەوەی کە گوێڕایەڵی خوا گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بێن. بۆ موسوڵمان ئاساییە کە بۆچوونی هەر زانایەك وەرگرێت کاتێك ئەو بۆچوونەیەکانگیر بێت

لەگەڵ قورئان و سوووننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام گەر بێت و ئەو بۆچوون و ڕایە پێچەوانە و دژی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت ئەوە ڕاستەوخۆ ڕەتدەکرێتەوە و قەبوڵ ناکرێت.

## ١٨/ ئەگەر هەموو ئاینەکان هانی خەڵک ئەدەن بۆ چاکەکاری. بۆچی ئەبێت تەنها شوێنی ئیسلام بکەوین:-

پرسیار:- ئەگەر لەبنچینەدا هەموو ئاینەکان هانی مرۆڤ دەدەن بۆ کاری چاك و چاکەکاری، کەواتە بۆچی ئەبێت تەنها شوێنی ئیسلام بکەوین؟ ئایا ناکرێت ئاینێکی تر هەڵبژێرین؟

وەڵام:-

✍ .. بوونی جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئیسلام و ئاینەکانی تر:-

لەبناغەدا سەرجەم ئاینەکان ئامۆژگاری مرۆڤەکان ئەکەن بۆ کردنی کاری چاك و چاکەکاری و خۆپاراستن لە خراپە و خراپەکاری. بەڵام ئاینی ئیسلام هەر بەمەوە ناوەستێت. ئیسلام ڕێبەریمان دەکات تا چاکەکاریەکی کرداریی و حەقیقی بەدەست بهێنین و ڕەگی خراپە و خراپەکاریش لەدەروون وناخی مرۆڤدا دەربهێنین. ئیسلام ڕەچاوی سروشتی مرۆڤ و ئاڵۆزی کۆمەڵگای مرۆڤ دەکات و پشت گوێیان

ناخــات. ئیســلام ڕێنیشــاندەرەێکە لەلایــەن زاتــی بەدیهێنــەر. هەرلەبەرئەمەش بە ئیسلام ئەوترێت "الدين الفكره" کەمانای ئاینی سروشتی مرۆڤ ئەدات.

✍ .. نموونە یەکەم: ئیسلام فەرمانمان پێدەکات بەنەکردنی دزی و هەروەها ڕێگاکانی ڕیشەکێشکردنی دزیکردنی بۆ باسکردووین:-

* ئیسلام چۆنیەتی ڕیشەکێشکردنی کاری دزی بۆباسکردووین:-

سەرجەم ئاینە سەرەکیەکان ئەوە بە شوێنکەوتووانیان فێردەکەن کە دزیکردن کارێکی خراپ و چەوتە، ئیسلامیش هەمان فرمان و قسەی ئەکات، دەی کەواتە چ جیاوازیەك لەنێوان ئیسلام و ئاینەکانی تر هەیە؟ جیاوازیەکە لەوەدایە کە ئیسلام جگە لەوەی شوێکەوتووانی فێردەکات کە دزیکردن تاوانە و کارێکی هەڵەیە، ئەو ڕێچکە کرداریانەش باس دەکات کە یارمەتی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی کۆمەڵایەتی دەدات کە خاڵیە لە دزیکردن.

* ئیسلام ئامادەی بە زەکات دان داوە:-

ئیسلام باس لە سیستەمی زەکات دان دەکات. شەریعەتی ئیسلام ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کەوا هەرکەسێك کە پاشەکەوتێکی هەبوو کە پلەی "نیصاب" تێپەڕکردبوو، بۆ نموونە (٨٥) گرام لە زێڕ ئەوە

پێویستە (٢.٥٪) لەو پاشەکەوتە ببەخشێت کە ساڵی بەسەردا سوڕابێتەوە. بەمەش ئەگەر دەوڵەمەندەکانی جیهان بەدروستی و تەواوی زەکاتیان بدایەت، ئەوکات هەژاری لەجیهاندا نەئەما، تەنانەت مرۆڤێکت نەدەبینی کە لەبرسێتیدا بمرێت.

* بڕینی دەست لەئەنجامی کاری دزیکردن:-

ئاینی ئیسلام سزای دەست بڕینی بۆ ئەنجامدانی دزیکردن داناوە. قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە لەم بابەت ئەدوێت:﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ ( المائدة )

ڕەنگە بێباوەڕێك بڵێت سزای دەستبڕین و سەدەی (٢١) !! بەڕاستی ئیسلام ئاینێکی بێ بەزەییە و دڕەندانەیە.

* دەرئەنجامی جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام:-

ئەمریکا کە بەیەکێك لەوڵاتە پێشکەوتووەکان دائەنرێت لەجیهاندا کەچی بەداخەوە بەرزترین ڕێژەی تاوانکاری و دزیکردن و بانك بڕینی تێدایە. ئێستاش وادابنێ کە شەریعەتی ئیسلام لەئەمریکادا جێبەجێ دەکرێت، هەر دەوڵەمەندێك زەکات دەدات بەپێدانی (٢.٥٪)ی ئەو پاشەکەوتەی کە لەسەرووی (٨٥) گرام زێڕە و ساڵی بەسەردا سوڕاوەتەوە. لەلایەکی تریشەوە ئەو کەسەی کە دزی دەکات،حکومەت

وەکو سزایەك هەڵدەستێت بە بڕینی دەستێکی. ئایا بەم شێوەیە ڕێژەی دزین و تالآنکردنی بانك لە ئەمریکا زیاد دەکات یاخود هەوەکو خۆی دەمایەوە یان ئەوەتا کەمی دەکرد؟ بێ هیچ گومانێك ڕێژەکە کەمی دەکرد. نەك هەرئەما بەڵکو بوونی یاسایەکی توندی وا ئەبێتە چاوترسی بۆ زۆر دز و تاوانکاری تر.

من هاوڕام لەوەی کە لەئێستادا ڕێژەی دز لەجیهاندا ئەوەندە زۆرە ئەگەر بێت دەستی هەموویان ببڕین ئەوکات هەزاران کەسی دەستبڕاو ئەبینین. بەلآم ئەو خاڵەی کە جێگای ئاماژەپێدانە ئەوەیە کە هەر لەگەڵ جێ بەجێ کردنی ئەم یاسایە ڕێژەی دزیکردن کەم دەکاتەوە، چونکە ئەوکات دزەکانی تر زۆر بەجدی پێش ئەوەی خۆی تووشی مەترسی بکات بیر لەدەرئەنجامەکانی دزیکردن دەکاتەوە. بەمەش هەر بیرکردنەوەیکی سادە و ساکاریش لە سزاکە، دزەکە ساردەکاتەوە و ڕێگری لێدەکات لە ئەنجامدانی دزیەکە. بەمەش ژمارەیەکی زۆر کەم دەمێننەوە کە دزی بکەن و لەئەنجامیشدا ژمارەیەکی کەم دەستیان دەبڕا و ملیۆنانی تریش ژیانێکی پڕ لە ئاسایش و سەلامەت دەژیان. بۆیە شوریعەتی ئیسلام شەرێعەتێکی کرادارییە و دەرئەنجام دەدات بەدەستەوە.

✍ .. نموونـەی دووەم: ئیسـلام دەسـت درێژیکردنـە سـەر ئـافرەتی حـەرام کـردووە و فـەرمانی کـردووە بـە (حیجـاب) باڵاپۆشـی و سـزای مەرگیشی بۆ دەستدرێژیکەر داناوە:-

* ئیسـلام ڕێگاکـانی لابـردن و نەهێشـتنی دەسـتدرێژیکردنە سـەر ئافرەتی باسکردووە:-

هـەموو ئایینـە سـەرەکیەکان دەسـت درێژیکردنـە سـەرئافرەتیان بەتاوانێکی گەورە و قێزەون لەقەڵەم داوە، بەهەمان شێوەش ئیسلام ئەم کارەی بە تـاوانێکی گەورە زانیووە. دەی کەواتە جیاوازی چیە لەنێوان ئاینی ئیسلام و ئاینەکانی تر؟ لەڕاستیدا جیاوازیەکە لەوەدایە کە ئیسلام نەك هەر تەنها ڕێنمایمان ئەکات بۆ ڕێزگرتن لە ئافرەت و بەگـەورە زانـینی تـاوانی دەسـت درێژیکردنەسـەر ئـافرەت، بـەڵکو ڕێگاچارەی زۆری بەڕوونی وپـوختی بـۆ ئامـادەکردووین تـا لەدوایـد کۆمەڵگا بتوانێت خۆی پاك بکاتەوە لەم تاوانە.

* ئـەمریکا بـەرزترین ڕێـژەی پـەلاماردان و دەسـت درێژیکردنـە سـەر ئافرەتی تێدایە:-

وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا کە بەیەکێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی، کەچـی لـەڕاپۆرتێکی (FBI)یـدا هـاتووە کەتـەنها لەسـاڵی (١٩٩٠)

لەئەمریکا (١٠٢٥٥٥) حاڵەتی پەلاماردان و دەست درێژیکردنە سەر ئافرەتی تێدا ڕوویداوە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە تەنها (١٦٪)ی حاڵەتەکان تۆمارکراون. جا بۆئەوەی ژمارەی درووستی حاڵەتەکانی پەلاماردان بزانین ئەوە دەبێت ئەو ژمارەیەی (١٠٢٥٥٥) کە ڕاپۆرتەکە داویەتی جارانی (٦.٢٥) بکەین. بەمەش دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە (٦٤٠٩٦٨) حاڵەتی پەلاماردنی سەر ئافرەت لەوساڵەدا ڕوویداوە. بەمەش ئەگەر بێت و ژمارەکە گشتیەکە (٦٤٠٩٦٨) دابەش بکەین بەسەر ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ (٣٦٥)، لەئەنجامدا دەردەکەوێت کە (١٧٥٦) حاڵەتی پەلاماردان و دەست درێژیکردنە سەر ئافرەت لەڕۆژێکدا و لەوساڵەدا ڕوویداوە.

دواتر ڕاپۆرتێکی تر بلاْوکرایەوە کە تێیدا ئاماژە بەڕوودانی (١٩٠٠) حاڵەتی پەلاماردانی ئافرەت دەکات لەڕۆژێکدا لەوڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا. بەگوێرەی ئامارێکی "National Crime Victimization" "قوربانیەکانی تاوانی نیشتیمانی" نوسینگەی داد لەبەشی دادی ئەمریکا تەنها لەساڵی (١٩٩٦) مزیکەی (٣٠٧٠٠٠) حاڵەتی پەلاماردانی ئافرەت ڕوویداوە، ئەمە لەکاتێکدا تەنها (٣١٪) حاڵەتەکان تۆمارکراون. هەربۆیەش (٣٠٧٠٠٠*٣٢٢٦ -٩٩٠٣٢٢) حاڵەتی

پەلاماردان بۆسەر ئافرەت لەساڵی (١٩٩٦) ڕوویداوە. بەم پێیەش نزیکەی (٢٧١٣) حاڵەتی پەلارماردان لەڕۆژێکدا لەساڵی (١٩٩٦) لە ئەمریکا ڕوویداوە. ئەگەر زیاتر ووردی بکەینەوە دەردەکەوێت کە لەهەر (٣٢) چرکەیەکدا یەك حاڵەتی دەست درێژیکردنە سەر ئافرەت ڕوودەدات لەئەمریکا. ڕاپۆرتەکەی (FBI) ساڵی (١٩٩٠) بەردەوام دەبێت و دەڵێت تەنها (١٠٪)ی دەستدرێژیکاران دەستگیرکراون لەکۆی سەرجەم حاڵەتە تۆمارکراوەکان، کە ئەمەش دەکاتە تەنها (١.٦٪)ی ژمارەی گشتی پەلاماردانی سەر ئافرەت کە ڕوویداوە لەو ساڵەدا. لەوانەشی کە دەستگیرکراوان، (٥٠٪)ی تاوانباران ئازادکراون پێش دادگایکردنیان. بەمەش تەنها (٠.٨٪)ی دەستدرێژیکارن ڕووبەڕووی دادگابوونەتەوە. بەواتایەکی تر ئەگەر بێت و کەسێك (١٢٥) جار پەلاماری ئافرەتی دابێت ئەوە تەنها یەکجار ئەگەر هەیە سزابدرێت. ڕنگە هەندێك کەس هێشتا ئەمە بەشتێکی باش بزانن، ئەمە لەکاتێکدا ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوەدەکات لەوانەی کە ڕووبەڕووی دادگا ئەبنەوە، (٥٠٪)یان سزای ساڵێك زیندانیان بۆ دەرکراوە. دەبێت ئەوەش بزانین کە یاسای ئەمریکا سزای حەوت ساڵ زیندانی داناوە بۆ ئەو جۆرە تاوانە. دادوەریش نەرمی و لێبوردەیی ئەنوێنێت بەرامبەر ئەوانەی کە

یەکەمجاریانە ئەم تاوانە ئەکەن. بیهێنە پێش چاوی خۆت کەسێك (١٢٥)جار پەلاماری ئافرەت دەدات و هەلی دەستگیرکردنیشی تەنها یەکجارە، لەگەڵ ئەمەشدا (٥٠٪) کاتەکان دادوەر لێبوردەیی و نەرمی ئەنوێنێت و سزای ساڵێك زیندانی دەردەکات.

* ئیسلام چارەسەری کرداری وگونجاوی هەیە بۆ کێشەکانی مرۆڤ:-

ئـــاینی ئیســـلام باشـــترین شـــاڕێگای ژیانـــە چـــونکە ڕێنمـــای و فێرکارییـەکانی بـریتی نـین لـە کۆمەڵـە نوسـراوێکی وشـك بـەڵکو چارەسـەری گونجـاو و کـرداری و واقعـین بـۆ کێشـەکانی مرۆڤایـەتی. بەمەش ئیسلام ئەنجامی باش و ئەرێ جا چ لەسەر ئاستی تاك یاخود ئاستی کۆمـەڵ ئـەدات بەدەستەوە بـە جـێ بـەجێکردنی تەواویانـەی ڕێنماییـەکانیان. بـەڵێ ئـاینی ئیسـلام باشـترین ڕێبـازی ژیانـە بـۆ مرۆڤایەتی چونکە ئاینێکی کرداری و بابەتیانەی جیهانیە کە تەنها و بۆ تاکە ڕەگەزێك یاخود نەتەوەیەکی دیاریکراو نەنێراوە.

## ١٩/ جیاوازی زۆر و قەبە لەنێوان ئیسلام و کرداری موسڵمانان:-

پرسیار:- ئەگەر ئیسلام باشترین ئاینە، کەواتە بۆچی موسڵمانان ناڕاستگۆ و متمانە پێنەکراون و کاری وەکو فێڵکردن و بەرتیل دان و بەکارهێنانی ماددەهۆشبەرەکان دەکەن؟

وەڵام:

✍ .. ڕاگەیاندنەکان قسەی ناڕاست بۆ ئیسلام هەڵدەبەستن:-

* بێ هیچ گومانێك ئیسلام باشترین ئاینە بەڵام لەبەرئەوەی ڕاگەیاندنەکان کەوتونەتە دەست ئەو ڕۆژئاوایانەی کە لەئیسلام ئەترسن، ئیسلام بەم شێوازێکی ناشرین پیشاندەدەن. ڕاگەیاندنەکان هەواڵ و زانیاری هەڵەو و دژ بە ئیسلام بڵاودەکەنەوە. ئەوان یان ئەوەتا زانیاریەکی هەڵەو و نادروست دەربارەی ئیسلام بڵاودەکەنەوە یان ئەوەتا وێنەی ئیسلام بەشێواوی وناڕێکیەوە پیشاندەدەن، یانیش ئەوەتا خاڵێکی ئیسلام لەناو کۆمەڵە خاڵێك بە دەستکاری و ناتەواویەوە ئاماژەپێدەدەن و دەورژێنن.

* کاتێك بۆمبێك لەشوێنێك ئەتەقێتەوە، ڕاستەوخۆ یەکەم گروپی خەڵك کە تۆمەتبار بکرێن تەنانەت بەبێ بوونی بەڵگەش بریتیە لە موسوڵمانان و بەمەش دەبنە سەردێری هەواڵەکان، بەڵام کاتێك ئەوە

ڕوون دەبێتەوە کە موسڵمانان بێتاوانن و ناموسڵمانێك بەرپرسیارە لەکارەکە ئیتر وەکو پێویست بایەخی پێنادرێت و وەك هەواڵێکی گرنگ نایەتە بینین.

* ئەگەر موسڵمانێکی (٥٠) ساڵە کچێکی (١٥) ساڵە مارە بکات ئەمەش دوای ڕەزامەندی کچەکە، ئەوە ئەمە دەبێتە هەواڵی سەر پەڕی یەکەمی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان. بەڵام کاتێك کەسێکی ناموسڵمانی (٥٠) ساڵە دەستدرێژی سێکسی دەکاتە سەر کچێکی (٦) ساڵە ئەوە ڕەنگە تەنها بەکورتی و لەپەڕەکانی ناوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئاماژەیەکی سادەی پێ بدەن. هەموو ڕۆژێك بەگشتی (٢٧١٣) حاڵەتی پەلاماردان ڕوودەدات لەوڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا کەچی لەهەواڵەکان ئەو بایەخەی پێنادرێت، وە من هیچ ڕەخنەیان لێ ناگرم چونکە ئەو جۆرە کارە بۆ ئەوان بووەتە شێوازی ژیانیان و ڕۆژانە ڕوودەدات.

✍ .. خاڵی ڕەش لەهەموو کۆمەڵگایەك:-

من ئەزانم کە موسڵمان هەن کە ناڕاستگۆ و متمانەپێنەکراون و فێڵ دەکەن، بەڵام ئەوەش دەبێت بزانین کە ڕاگەیاندنەکان بەشێوەیەك باسی لێوەدەکەن وەك ئەوەی تەنها کۆمەڵگای ئیسلامی و موسڵمانان بەم کارانەوە هەڵسن. لەهەموو کۆمەڵگایەك کەسانی خراپ بوونیان هەیە و

کۆمڵگای ئیسلامیش بەدەر نیە لەمە. من موسڵمان ئەناسم کە ئارەق خۆرە و زیاتر لە ناموسڵمانێك ئەخواتەوە.

✍ .. موسوڵمانان بەکۆمەڵ باشترینن:-

سەرەڕای بوونی ئەو خاڵە ڕەشانە لەکۆمەڵگای ئیسلامی کەچی موسڵمانان بەکۆمەڵ یاخود لەشێوەی گروپێکدا باشترین کۆمەڵگای جیهانن. ئێمەی موسڵمانان گەورەترین کۆمەڵگاین لە نەخواردنەوەی ئارەق و مەی. بەکۆمەڵ ئێمە کۆمەڵگایەکین کە بەرزترین ڕێژەی خێرو بەخشین ئەنجام ئەدەین. هیچ کۆمەڵگایەك لەجیهاندا کە وەك کۆمەڵگای ئیسلامی بێت کاتێك باس دێتەسەر جوامێری و سەنگینی مرۆڤ، یان خۆپارێزی و خۆدوورگرتن لە مەی و ئارەق، یاخود ئەوکاتەشی باسی بەهای مرۆڤ و بەها بەرزەکانی کۆمەڵگا دەکرێت.

✍ .. بڕیار لە باش و خراپی ئۆتۆمبێلێك مەدە لەسەر بناغەی شۆفێرەکە:-

وادابنێ تۆ دەتەوێت دوایین مۆدێلی ئۆتۆمبێلی (مارسیدس) هەڵبسەنگێنیت و ئەبینیت کەسێك کە بەتەواوی لە لێخوڕین نازانێت دەست دەکات بە لێخوڕین و لەئەنجامدا خۆی بەشتێکدا ئەکێشێت و زیانێکی زۆر بەئۆتۆمبێلەکە ئەگەیەنێت. ئایە تۆ لەم دۆخەدا کێ بە

بەرپرسیار ئەزانیت؟ ئۆتۆمبێلەکە یان شۆفێرەکە؟ بێگومان ئەوەی شایستەی لۆمەکردنە شۆفێرەکەیە. بۆ زانینی باشی ئۆتۆمبێلێك ناکرێت سەیری شۆفێرەکە بکەین بەڵکو ئەوەی پێویستە کۆڵینەوە لە توانا و تایبەتمەندیەکانی ئۆتۆمبێلەکە، بۆ نموونە خێرایی ئۆتۆمبێلەکە چەندە، چەنێك سووتەمەنی بەکاردێنێت، یاخود تایبەتمەندی سەلامەتی تێیدا چۆنە. بەهەمان شێوەش ئەگەر من لەوەدا هاوڕا بم لەگەڵت کە موسڵمانان هەموویان خراپن بەڵام خۆناکرێت بەسەیرکردنی موسڵمانان بکەینە بڕیاردان بەسەر ئاینی ئیسلام. ئەگەر ئەتەوێت باشی و خراپی ئاینی ئیسلامت بۆ دەربکەوێت پێویستە بڕوانیتە سەرچاوە سەرەکیەکانی ئیسلام کەئەوانیش قورئان و سونەتی پێغەمبەرن (ﷺ).

✍ .. لەڕێگای هەڵسەنگاندنی باشترین شوێنکەوتووانی، ئیسلام هەڵسەنگێنە:-

ئەگەر تۆ هەربەراستی دەتەوێت باشی و خراپی ئۆتۆمبێلەکە تاقی بکەیتەوە ئەوە شوفێرێکی شارەزا و لێهاتوو بهێنە. بەهامان شێوەش بۆ هەڵسەنگاندی باشی و خراپی ئیسلام ئەوە پێویستە باشترین شوێنکەوتووی هەڵبژێریت بۆ هەڵسەنگاند کە ئەویش پێغەمبەرەی

خۆشەویستە (ﷺ). جگە لەموسوڵمانەکان، کۆمەڵە مێژوونووس و نوسەرێکی ڕاستگۆ و دوور لەهیچ دەمارگیری و لاگیرییەك کە موسوڵمانیش نین ئەو ڕاستیە دووپات دەکەنەوە کە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) باشترین مرۆڤە لەجیهاندا. بەگوێرەی پەرتووکەکەی "مایکل ئێچ هارت" کەبەناوی "سەد کەسایەتی کاریگەری مێژوو"ە، پێغەمبەر (ﷺ) کەسایەتی یەکەمە و لەپێشەوەی هەموویانەوەیە. زۆر نموونەی تر هەن لەم جۆرە نووسەر و مێژوونووسە ڕاستگۆیانە کە ستایشی پێغەمبەریان (ﷺ) کردووە، لەوانەش کەسانی وەکو "تۆماس کارلیل، لامارتین...هتد."

## ٢٠/ ناوبردنی ئەوانەی موسوڵمان نین بە "کافر":-

پرسیار: بۆچی موسڵمانان ئەوانەی کە موسڵمان نین هەراسان ئەکەن بەوەی بە "کافر"ناویان دەبەن؟

وەڵام: "کافر" واتا ئەوکەسەی کە شتێك ڕەتدەکاتەوە:-

وشەی "کافر" وەرگیراوە لەوشەی "کفر" کە بەمانای شاردنەوە یاخود ڕەتکردنەوە دێت. لەزاراوەی ئیسلامیدا "کافر" بەکەسێك ئەوترێت کە ڕاستی و حەقیقەتی ئیسلام ڕەتبکاتەوە یاخود بیانشارێتەوە بەمەش بەو کەسە دەوترێت ناموسڵمان. جا ئەگەر ناموسڵمانێك ئەوەی پێ هەراسانکردن بێت گەر بە "کافر" بانگ بکرێت ئەوە دەرئەنجامی هەڵە تێگەیشتنێتی لە ئاینی ئیسلام. بۆیە ئەوکەسە پێویستە پەنابەرێتە بەر سەرچاوەیەکی گونجاو دەربارەی تێگەیشتن لە ئیسلام و زاروەوە ئیسلامیەکان. ئەوکات نەك هەر هەست بەهەراسان بوون ناکات بەڵکو بگرە ئیسلام بۆ ئەمە بەرز ئەنرخێنێت.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# ناوەڕۆک

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |